Zakho Centre
for Kurdish Studies



# کادانی
# سەدرودین
# دیوانا مەلا

ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن
د. فـــاخر حەسەن گولی

# دیوانا

# مەلا سەدرودین کادانی

## مەلا سەدرودین موحەمەد سادق مەلا عەزیز مەلا پیر کادانی زێباری


ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن

د. فاخر حەسەن گولی



Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخو بو ڤەکولینێن کوردی

سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی


| | |
|---|---|
| پەرتووک | دیوانا<br>مەلا سەدرودین کادانی |
| ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن | د. فاخر حەسەن گولی |
| چاپ | ئێکێ/ ٢٠٢٢ |
| دیزاین | دیـــار عـبـدالله |
| بەرگ | جەگەرخوین جەمیل<br>وارهێل عبدالباقی |
| ISBN | 978-9922-9169-3-4 |
| ژمارا سپاردنێ | D- / ٢٦٤٩ / ٢١ |




Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی


zcks@uoz.edu.krd +964 750 471 0863
Iraq- Kurdistan region, Zakho- Univesity of zakho

# پێشەکی

ئەڤ دیوانە مینا دیوانێن دیتر ژ چەند هەلبەستێن جۆراوجور پێکهاتیە و هەر ئێك ژ ئەوان خوەدی ڕامانەکا تایبەتن، د ئەڤێ پێشەکیێدا مە تیژك ئێخستیە ل سەر گشت ئالیێن ژیاننامەیا هەلبەستڤانی، هەوڵ و بزاڤێن ئەوی بۆ بدەستڤەهێنانا زانستێ ئایینی و مفا وەرگرتن ژ زانین و زانستێ مەزنە زانایێن دەڤەرا ئاکرێ، هەتا ژیاننامەیا ئەوی دناڤ ڕێزێن پێشمەرگەیدا، سەربازیا ب دارێ زۆرێ، ئەدەبی و ئەرکێ مەلاتیێ و ل داویێ گرنگترین خالێن گرێدای ب ئەڤێ دیوانێڤە.

مەلا سەدرودین موحەمەد سادق مەلا عەزیز مەلا پیر، ل ساڵا (١٩٥٤)ێ، هاتیە ل سەر دونیایێ، ژ بنەماڵا (ماڵ مەلا)یە سەر ب گوندێ (کادانێ) هۆزا (زێباریان)ڤە، بنەماڵا ناڤبری خوەدی پێگەهەکا بهێزا ئایینی، زانستی و جڤاکینە. ناڤهاتی قورئانا پیرۆز ل دەڤ بابێ خوە خواندیە، وانەیێن خواندنێن ئیسلامی یێن دەستپێکێ ل نك زانایان (مەلا ئەحمەد فەقی زێباری، شێخ عەبدولعەزیز مەعروف شرتی) ل ئاکرێ وەرگرتینە، هەر دیسان ل دەستپێکا ساڵێن شێستان ل چەرخێ بیستێ ل دەڤ زانایێن ناڤهاتی وانەیێن بەشەك ژ پەرتووکا (فتح القریب المجیب) یا ئیمامێ شافعی و پەرتووکا (البناء) د زانستی (صرفا) عەرەبیدا خواندینە. پاشان چوویە دەڤ زانایێ ناڤدارێ دەڤەرێ مامێ خوە (مەلا پیر) کو کەسەکێ خودان شیان د بیاڤێ زانستێن ئیسلامیێدا بوو کو خواندنگەها ئایینی ل گوندێ (باشقال ئاغا) ل دەڤەرا ئاکرێ پاشان ل مزگەڤتا (ئاڤدەل ئاغا) ل ئاکرێ هەبووینە، پەرتووکێن (السراج الوهاج) و (اعانة الطالبین) د بیاڤێ فقهیدا و پشکەك ژ پەرتووکێن

(العوامل الجرجاني) و (الاظهار) سەر ب (نەحوا) عەرەبی و بەشەك ژ پەرتووكا (العزى و المقصود) سەر ب (صەرفا) عەرەبی خواندینە، ب كورتی مفایەكێ باش ژ وانەیێن (مەلا پیر)ی وەرگرتیە.

ل سالا (١٩٦٦)ێ پشتی ئەزموون ل خواندنگەها ئایینی ل مزگەفتا مەزن ل ئاكرێ ئەنجامداین ل وێرێ دبیتە خواندەكار و ل دویف بەرنامەیێ داڕشتیێ خواندنگەهێ ل دەڤ زانایان (مەلا ئەحمەد مەلا موحەمەد ئیمام)، (مەلا پیر) و (مەلا موحەمەد ئاكرەیی) دەست ب خواندنێ كر.

ل سالا (١٩٧٢)ێ ژیانا خێزانی ل گەل خانم (عائشە حەسەن تاهر) پێكهینا و خودایێ مەزن چار كوڕ (عەبدولجەلیل، موحەمەد، موحەمەد، سادق) و شەش كچ (كەوثەر، كەلثوم، نەهلە، موم، خەلات، نۆرستان) ب ئەوان بەخشی، ل سالا (١٩٧٤)ێ پشتی كو جارەكا دیتر شۆڕەشا ئەیلولێ سەرهەلدایەڤە پەیوەندی ب شۆڕشێڤە كر و نەشیا ئەزمونێن شەشێ ئامادەیی ئەنجام بدەت. لێ د هەمان سالدا مەلا سەدرودین ب مەرەما ئەنجامدانا ئەزموونێن بەكەلوری بەرەڤ چومان نێزیك سنورێ ئیرانێ دچیت و د ئەنجامدا شیا دناڤ شۆڕەشێدا باوەرنامەیێ بدەستخوەڤە بهینیت. ل ڕێككەڤتی (١٩٧٤/١١/٩)ێ دزڤڕیتەڤە ئاكرێ. پاشان دچیتە باژێڕێ مویسل و ئەزموونێن شەشێ ئامادەیی ئەنجام ددەت و باوەرنامێ بدەستخوەڤە دهێنیت، ل ڕێككەڤتی (١٩٧٦/١/١٥) پشكداری د خۆلا بەرهەڤكرنا ماموستایاندا ل بەغداد كر، شیا باوەرنامێ بدەستخوەڤە بهینیت و ژبەر ڕەوشا ئالۆزا دەڤەرێ زڤڕیەڤە ئاكرێ.

د هەمان سالدا، پشتی دەرچوونێ چوویە سەربازیا زۆرە مللی لێ پشتی هەیڤەك و نیڤان لێبوورینا گشتی ژ ئەوان كوردان گرت ئەوێن زڤرینەڤە، لێ

لێبوورینێ ژ ئەوی نەگرت و بەرهەڤ نەبوو بچیتە سەربازیێ، لەوڕا د هەمان دەمدا دچیتە گوندێ (ئەرتون) ل ناڤ زێباریان کو دەڤەرەکا ژێر دەستهەلاتا پێشمەرگەی دابوو، دبیتە پێشنڤێژ و گۆتارخوینێ گوندی و دەست ب وانەدانا خواندەکاران دکەت و نەهـ سالان ل وێرێ دمینیت.

ل ڕێککەڤتی (١٩٨٤/١١/٢٤)ێ پشتی کو دەڤەر ژلایێ حکوومەتێڤە هاتی داگیرکرن، ژ نەچاری خوە ڕادەستی حکوومەتێ کر و تووشی هەمی جۆرە ئەشکەنجەدانێ بوو، دووبارە دهنێرنە سەربازیێ د (السرية المرتبة)دا، ل (١٩٨٦/١/١٥)ێ بۆ گوندێ (بامشمش) دهێتە ڕەوانەکرن و ل شوینا سەربازیێ ل گوندێ ناڤبری ب کارێ پێشنڤێژ و گۆتارخوینێ ڕادبیت.

ل ڕێککەڤتی (١٩٨٩/٣/٧)ێ ب مەبەستا ئەنجامدانا ئەزموونا پێشنڤێژیێ بەرەڤ بەغداد چوو، پشتی قەبویل بووی هاتە دامەزراندن و هاتە ڕاسپاڕدن بچیتە باشوورێ عیراقێ. لێ ژبەر پێگیری نەکرنا ئەوی هیچ قازانجەك ژ ئەنجامێ ئەزموونێ وەرناگرت.

ل سالا (١٩٩١)ێ پشتی حکوومەتا عیراقێ بڕیارێ دای وەلاتێ کۆێتێ داگیر بکەت، پڕانیا لەشکەرێ عیراقێ هاتنە گازیکرن ژ ئەوان (سریا) سەربازیا (مەلا سەدرودینی)، بەرەڤ کویتێ هاتنە وەشاندن، لێ پشتی کێشا کویتێ ب داوی هاتی و لەشکەرێ عیراقێ زڤڕیەڤە، ل ڕێککەڤتی (١٩٩١/٣/١)ێ بۆ هەتاهەتایی ژ سەربازیێ هاتە ئازادکرن. هەر ل سالا (١٩٩١)ێ وەك بەرپرسێ ناوچا ئێکەتیا زانایێن ئایینێ ئیسلامیێ کوردستانێ - تایێ ئاکرێ هاتە هلبژارتن، لێ ژبەر نەساخیا گرانا بابێ خوە دەست ژ کارێ بۆ پسمامێ خوە (مەلا موحەمەد سەعید مەلا پیر) بەردا.

ل سالا (١٩٩٤)ێ پشتی بابێ ئەوی مالئاڤاییی کری، ل سالا (١٩٩٥)ێ بەرەڤ (شەقلاوە) ب مەبەستا سەرژنوی ئەنجامدانا ئەزموونا پێشنڤێژیێ چوو، پشتی هاتیە قەبویلکرن، ل مزگەڤتا مەزنا گوندێ (بامشمش) هاتە دامەزراندن. ژبۆ پێشڤەبرنا زانست و خواندنێن ئیسلامی ل سالا (١٩٩٨)ێ مەلا سەدرودین ل گەل هەڤالێن خوە (مەلا خالد سالح یەحیا) و (مەلا ئەحمەد عەبدولعەزیز مەعروف) هەولا ڤەکرنا خواندنگەهەکا ئایینی دان و داخوازی پێشکێشی حکوومەتا هەرێمێ کرن و ل دویڤ داخوازیا ئەوان خواندنگەهەکا ئایینی سەر ب وەزارەتا ئەوقافا هەرێما کوردستان ل دەڤەرا (نەهلە) هاتە ڤەکرن و مەلا سەدرودین ل گەل هەڤالێن خوە دەست ب وانەدانا خواندەکاران کرن. ب درێژاهیا وانەدانا ئەوی وەك ماموستایێ ئایینی، هژمارەکا زێدە یا داخوازکەرێن زانستێن ئایینی مفا ژ زانین و زانستێ مەلای وەرگرتینە و گەهشتینە ئاستەکێ باشێ زانستی. ل سالا (٢٠٠٠)ێ وەك بەرپرسێ لقا ئێکەتیا زانایین ئایینێ ئیسلامیێ کوردستانێ - تایێ ئاکرێ هاتیە هلبژارتن. هەر ژ سالا (١٩٩٨ هەتا ٢٠١٢)ێ وەك ماموستایێ ئایینی ل خواندنگەها ئایینی ل (دینارتێ) مژویلی وانە گۆتنێ بوو. نوکە ئاکنجیێ گوندێ (بامشمش)ە.

ناڤبری ژبەر ئەوان نەخوەشی و کول و کۆڤانێن ب سەرێ مللەتێ کورد هاتین ل (نیسانا ١٩٨٧)ێ دەست ب ڤەهاندنا هەلبەستان ب هەر دوو زمانێن کوردی و عەرەبی کر و ژ (٥١) هەلبەستان کو (٤١) ب زمانێ کوردی و (١٠) ب زمانێ عەرەبی ڤەهاندینە. گرنگترین تیبینیێن ئەڤێ دیوانێ پێکهاتنە ژ:

ـ ئێكەم هەلبەستا خوە ل (٢٠ نیسانا ١٩٨٧)ێ ل گوندێ (بامشمش) ل ژێر ناڤونیشانێ (خەباتكرن) ڤەهاندیە و چەند مالكێن دەستپێكا ئەوێ ب ئەڤی شێوەینە:

هلــۆ گــەلــێ مــە هــەســتە
ســــەرێ زۆردارا ب بــــەســـتە

هــەســتە هــێش نــەبــی درەنــگ
نـــە ب گرتنـــا دارێ تڤـــەنـــگ

ب قـــەلــــەم و دەعـــوا و دەنـــگ
ڕزگار بكە كوردستانا بەها سەنگ

ـ هەلبەستڤانی ل دویماهیكا پتریا هەلبەستێن خوە ناڤێ خوە (سەدرٍ یان صەدر) و سالا ڤەهاندنا هەلبەستێ نڤیسیە. بۆ نموونە:

دێ هــــەر بێـــژم دێ ڤـــــەهـــوینم
ئاشـــــێ خــــۆ ژی دێ گێـــــرینم
مـــــەتـــــەلۆكـــــا ژ وارا ئیــــنم
هـەتـا باركـەت (صـەدر) ب هێلیـت وارێ خـۆ

ـ پڕانیا هەلبەستێن ئەڤێ دیوانێ نیشتیمانی و وەلاتپارێزینە، ئەڤە ژی بۆ ئەوێ هەستێ بەرزێ مەلایی، بەرامبەر گەل و وەلاتێ خوە هەی دزڤڕیت، مینا هەلبەستا "كوردینۆ"، "ئەم ناوەستین ل خەباتێ" و... هتد). د دەستپێكا هەلبەستا ب ناڤێ "كوردینۆ" دبێژیت:

كوردینۆ نانێ وە پاتی ب دەستێ خۆ
چ ویژدانـە بكـەنـە دەڤـێ دژێ خـۆ
فەرە گەلۆ دەستێ خۆ بەن دەڤێ خۆ
سفرێ دانن ل سەر مێزێ ل بەرێ خۆ

- مەلا دناڤ هەلبەستێن خوەدا بەردەوام باسێ ئێكگرتن و ئێكرێزيا كوردان دكەت و خوازيارێ ئەوێ چەندێيە كو كورد ببنە ئێك. د مالكەكا هەلبەستێن خوەدا دبێژيت:

هلۆن رابن گەلی كوردا ل كوردستانێ
نێ ئەڤرۆيە رۆژا مان و يان نەمانێ
هەمی پێكڤە ئامادەبن ل گورەپانێ
ئێك گرتنە نيشانێ مان و ژيانێ
مانە شەرمە بۆ مە كوردا ل كوردستانێ
ببين هەڤال دگەل دوژمنێت ڤێ ژيانێ

- ژ دەه هەلبەستێن ئەوی يێن ب زمانێ عەرەبی، دوو ژ ئەوان ب زمانێ كوردی ژێ ڤەهاندينە هەلبەستێن "سلام الی ملا حاجي" و "في وفاة عمي ملا پير الكاداني".

- هەر ل ئەوێ سالێ دەست ب ڤەهاندنا هەلبەستان كری واتە سالێ (١٩٨٧)ێ چاردە هەلبەست ڤەهاندبوون، پتريا ئەوان ل سەر وەلاتپارێزييێنە ژ ئەوان: "وارێ منە نەيار باركە"، "گولا من يا تينيە"، "ل مە ئاڤا بوو رەوشا چرا و...هتد). د دەستپێكا هەلبەستا ب ناڤێ "وارێ منە نەيار باركە" دبێژيت:

نەيار نەيار باركە ل ڤی واری
وارێ منە نەيێ تەيە تو زۆرداری

نادەم ژ تەرا ئەڤێ خاكێ و داروباری
ناڤ دەركەڤە دەحل و درێ كورەماری

- هەر پەيڤەكا نە رۆهن يان پەيڤێن پێدڤی ب پێناسەكرنێ د ديوانێدا، ب شێوەيەكێ رێكوپێك ل پەراوێزان هاتينە نڤيسين.

- دیوان ل دویف ڕۆژ و هەیف و ساڵ و جهێ ڤەهاندنا هەلبەستێ هاتیە ڕێکخستن.

- ئەگەر ب شێوەیەکێ گشتی هژمارا هەلبەستێن ئەوی یێن ب زمانێ کوردی بەرچاڤ بکەین ژ کۆما (٤١) هەلبەستان، (٣٣)ێ هەلبەستێن ئەوی دناڤبەرا سالێن (١٩٨٧-١٩٩١) دا هاتینە ڤەهاندن.

- هەلبەستڤانی مفا ژ چەندین پەیڤێن ب زمانێ عەرەبی وەرگرتیە بۆ نموونە: "ابادة (ژناڤبرن)، بضاعة (کەلوپەل)، وفق اللهم (خودێ سەربێخیت)، حزین (خەمگین) و...هتد".

- چەندین پەیڤێن ب زمانێ فارسی ژی هاتینە بکارهێنان بۆ نموونە وەك: چشم (چاڤ)، سیاه (ڕەش)، واژگون (وەرگەریا و تێکچووی)، خودمختاری (حوکمێ زاتی) و زیبا (جوانی)، ستایش (سوپاسی) و... هتد.

- ناڤێ چەندین کەسایەتییێن کورد دناڤ هەلبەستاندا هاتینە بۆ نموونە: (مەلا مستەفا بارزانی، قازی موحەمەد و شێخ عوبەیدوڵلاهێ نەهری).

ل داویێ سوپاسیا خودایێ ئەرد و ئەسمانیان دکەین کو هێز و شیان داینە مە ئەڤی بەرهەمی ڕێکبێخین، هەروەسا سوپاسیا (مەلا سەدرودینی) دکەین کو بەردەوام هاریکار و پشتەڤانێ مەبوو، هیڤیدارین ئەڤ بەرهەمە ببیتە جهێ مفا وەرگرتنا گشت تورەڤان و خوەندەڤانان.

د. فاخرحەسەن گولی

دهۆك ٢٠٢١

# پێشەکی

ب ڕەحما تە خودێ حەمدا تە دکەم
ل سەر ناز و نیعمەتێت تە شوکرا تە دکەم

من باوەرە خودا هەر تو یەزدانی
هەر تو دانەرێ ئەفلاك و چینین ئەرد و ئەسمانی

زیندەوەر تە دان ل هەمی چین و ل هەمی شوینا
بارانا ڕەحمێ ل وان تە بارینا

هەر ئێك ب زمان و لەهجا خۆ خودا
ستایش[1] و پەرستنا تە دکەن جودا جودا

درووود[2] و سلاڤ و ڕەحما غەففاری[3]
ل سەر تە (موحەمەد) چەندی نازداری

ئال و هەڤالان هەما ڤەگەڕیتن
دگەل وان هەما مە ب جەمینیتن

دیار و ئاشکرایە هەلبەست و هۆزان
وەسیلێت[4] گرنگن بۆ تەعبیر[5] لێدان

---

(١) (ستایش) پەیڤەکا فارسییە و ڕامانا (سوپاسی) ددەت.

(٢) (درووود) پەیڤەکا فارسییە و ڕامانا (سلاڤ) ددەت.

(٣) ئێك ژ سالوخەتێن خودایی مەزنە و ڕامانا (گونەها دبووریت) ددەت.

(٤) ڕێکێت.

(٥) دەربڕین.

ل هەست و کەوتێت ژار و بەلنگازا
کەسانێت تەپەسەر و بێ گازا

کوردا هەر خۆ دیتی ژار و بندەست
لەوا (صەدر)ی ڤەهاندن ب وا هەلبەست

مە زۆر بۆ گۆت و شیرەت لێکرن
وان گوه نەدامە گشت ئاڤێ برن

کەکو یا پێتڤی مە ل سەر خۆ ڕاکری
خودا ڕزگارکە مە ل گەرما ئاگری

## خەباتکرن[1]

هلۆ گەلێ مە هەستە[2]
سەرێ زۆردارا ب پەستە

هەستە هێش[3] نەبی درەنگ
نە ب گرتنا دارێ تڤەنگ

ب قەلەم و دەعوا[4] و دەنگ
ڕزگار بکە کوردستانا بەها سەنگ[5]

ئەو کوردستانا شوخ و شەنگ و ڕەنگینە
ل ژێر دەستێ دوژمنا هەر دەم حەزینە[6]

هندی کو هەبن زۆردار و خوینمێژ
دێ هەبن هەڤکارێت خائین و خوینڕێژ

دێ حالێ مە کوردا ئەڤە بیت و هێش
خۆ هشیارکەن مە کارەکێ مەزنێ ل پێش



---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠/٤/١٩٨٧)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

(2) ڕابە.

(3) هێشتا.

(4) بانگخوازی، گازیکرن.

(5) ب بوها.

(6) خەمگینە.

هەستن بران و خۆ هشیارکەن
دەست ل یەك بگرن مل بۆ ئێك خارکەن

بۆ وەغەرێ خۆ کار و بارکەن
ل مەیدانێت جەنگی خۆ دیارکەن

هەستن بکەن خەباتێ ل سەرچیا و دەرگەلیا
دا ل نشتیمانی نەبن شەرمە دەهۆ ڕووهسیا[١]

مللەت دەربینن ل ژێر دەستێ هەمیا
ب قەبینن وەکی (کەو)ێ ل سەرێ چیا

ئازادکەن ئێخسیر و مەحکووم و بەندیا
خۆشکەن دلێ ئەسمەرێن چاڤ ل ڕیا

ژ نوی خۆشکەن کەیفا زەوی و زەڤیا
ئاڤدەن ئەوێ هش بووی ل هەلال و شەنگە بیا

دانێن حوکمێ کوردا هەر چارجیا
ل عیراق و ئیران و تورکیا و سوریا

گەلی برا نەبوو چەندا بەلکی بۆ مە هەمیا
مژدە بدەن بۆ شەهیدێن کو خوینا وان لێ ڕژیا

ل سەر خاکا کوردستانێ کو ئازادی دڤیا
بەرێ ڕەنجا وا هاتە جێ تو عەفوکە خاوەن کەرەم هەمیا

عەدالەتێ بێخن هەمی دەرا ل دەشت و چیا
پێکڤە ب چەرن گورگ و بزن دگەل کویڤیا

هنگ بنێڕن بران و ئێکدوو گرت خەیبەریا[١]

---

[١] ڕوی ڕەش.

بوونە دەولەت ئەرێ ما هوین خرابترن ل جویا[٢]

بلا بەس بیت نەهێلن ل بەینا خۆ نەیاریا
دوژمن ناکەت جیاوازی بەینا ڕەش و سپیا

ڤێکرا هەڕن ناڤ سەنگەر و تاپیا[٣]
پێکڤە بێژن کوردستان یان نەمان بۆ هەمیا

خوزگا دیتی(صەدرودینی) ئەڤ حوکمە گەریا
ئاینێ ئیسلامێ بیتە سەربار و سەرووەرێ هەمیا

پاشی بلا ئەز چووبام گۆڕێ تاریا
دگەل ئیمانێ ناڤ عالەما بەرزەخیا[٤]



---

(١) غەزوا (شەڕێ) خەیبەرێ ل سالا (٧ك)ی بەرامبەر (٦٢٨ز)ی دناڤبەرا موسلمانان و جوهیاندا هاتبوو ڕویدان.

(٢) جۆهی، یەهودی.

(٣) خەندەق، چال.

(٤) بەرزەخ ب زمانێ عەرەبی ڕامانا ئەوی تشتی ددەت ئەوا دکەڤیتە دناڤبەرا دوو تشتاندا. لێ د تێگەها ئیسلامیدا بۆ ئەوێ جیهانێ دهێتە گۆتن ئەوا دکەڤیتە دناڤبەرا ئەڤێ جیهانێ و جیهانا دویماهیی (ئاخرەت-قیامەتێ)دا.

## واریٚ منه نەیار بارکه[1]

نــەیــار نــەیــار بارکــه ل ڤــی واری
واریٚ منــه نــەیــیٚ تــەیــه تــو زۆرداری

نــادەم ژ تــەڕا ئــەڤــیٚ خــاکیٚ و داروبــاری
نــاڤ دەرکــەڤــه دەحــل و دڕیٚ کــورەمــاری

ئــەزم ئــەزم پێشــمەرگــەمــه تــه چــاڤ تــاری
بــۆ وەلاتــی جــان فیدامــه ســویندا خــاری

واریٚ ڕەنگــین چێــرا مــەڕ و پــەز کێڤیــا
نــادەم دەســتیٚ چ خــوین مێــژوو ڕوی ب تــەنیــا

هــەمی بیشــێت فــەهــد[2] و پڵنــگ و حــەیــدەریا[3]
ناهێــت بکێــر وان دەهبــەلــوك و ڕویڤیــا

ل ســەر دارا دخــوینن بلبــل کــەو گــەلیــا
کــەویٚ ڕۆبــاد ل ســەر چیــا بــەر کــەڤیــا

هــیچ تــو نــەشــێی خــراب بکــەی ڤــی دیــواری
ئــەو دوم دومــه مــه چێکــری ب کاروبــاری

ئــەگــەر شــەڤ چــوو مــژ بــالا بــۆ نــەمــا تــاری
ڕۆژ دیٚ هــەلێــت دیٚ ڕۆنــاهی هێتــه واری

---

[1] ئەڤ هەلبەسته ل ڕێککەفتی (١٩٨٧/٥/٢٠)یٚ، ل گوندیٚ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیه ڤەهاندن.

[2] فەهەد جۆرەکیٚ پڵنگانه.

[3] حەیدەر ناڤەکه ژ ناڤێن شێری، ژ ناسناڤێن ئیمام عەلی کوڕیٚ ئەبو تالبی یه.

هۆ براینۆ چما ناکەین کاروباری
پێکڤە ڕابین یێ د بەرۆژی و یێ د نزاری

دەست پاڤێژن چەکێ سەقا ب ژەهرا ماری
کوتکی[1] دانن سەرێ ئەڤی زۆرداری

ڕزگار بکەن گەلی برا گەلێ ئاری
بدەرینن ل ژێر دەستێ ڤی خوین خاری

ئەلندا[2] گەش کەس نەدایە ب شەڤا تاری
کو ئەو نەبن شەرەف فرۆش بەرتیل خاری

ڕۆژەك دێ هێت دێ ڕۆناهی ئێتە واری
بەلێ نزا کا دێ بینم یان دێ بارکەم ب ئێك جاری

ئەگەر ئەز چووم (صەدر)ی نەدیت خۆدموختاری[3]
هوین ببێژن ڕەحما یەزدان ل تە باری



---

(١) زووری.

(٢) بۆ ئەوێ ڕۆناهیا سۆرە ئەوا دەمێ ڕۆژئاڤا بوونێ دهێتە گۆتن.

(٣) حوکمێ زاتی.

## رۆژا مان و نەمانێ[1]

هلۆن رابن گەلی کوردا ل کوردستانێ
نێ ئەڤرۆیە رۆژا مان و یان نەمانێ

هەمی پێکڤە ئامادەبن ل گۆرەپانێ
ئێککگرتنە نیشانێ مان و ژیانێ

مانە شەرمە بۆ مە کوردا ل کوردستانێ
ببین هەڤال دگەل دوژمنێت ڤێ ژیانێ

رژێم دبێژیت (ئیبادە)[2] کەن کوردا ل کوردستانێ
نینە بۆوان مافێت مان و ژیانێ

ئەم دبێژین بۆ رژێمێ و ڤێ جیهانێ
مە دڤێت بژین مافێ مەیە ل عومرانێ[3]

گەلی کوردا هوین بیر نەکەن نەهێلانێ
هەشتێ و هەفتێ رۆژا چارێ مەها نیسانێ[4]

بەلاڤەکر ئەڤ بریارە دەمێ جەنگێ دگەل ئیرانێ
ل هەمی درا رابوون سەرخۆ کورە شێرێت کوردستانێ

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەفتی (١٩٨٧/٥/٢٧)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) ژناڤبرن، بریاندن، قرکرن، نەهێلانا کەسێ، کوشتنا هەمیان و... هتد.

(٣) ئاڤاکرنێ.

(٤) ٤ نیسانێ ١٩٨٧.

هەمی ڕەخا دژی دوژمن چوون مەیدانێ
لێك بژاندن وەكی (گورگێ) دچیتە پەزێ كوتانێ

ئەرێ برا ئەڤا كری ویژدان كانێ
هۆ نەكریە شوعییێت ڕووسیا ل ئەفغانێ

ئۆ نەكریە كەسێ بەش هەی ل ویژدانێ
بەلێ چ بكەین بریندارین دەرمان كانێ

بكارئینا چەكێ حەرام نیڤا هەیڤا ڕەمەزانێ
بچیك و ژن تەف هاڤێتن بەیابانێ[1]

ئەرێ نەیار نابیت بۆ تە یا تە دیتی د خەونێدا
ئەز دێ كوردا ئیبادە[2] كەم دێ عەرەبا ئینم جێدا

جهێ كوردا كوردستانە ڕۆژا هاتین ڤێ دنێ دا
كوردو وەطەن[3] خوین و گوشتن ل ئێك و دوو نابن جودا



---

(١) چوول، سەحرا.

(٢) ژناڤبرن، كوشتن.

(٣) وەلات.

## بەرسڤ[1]

خـــانی[2] بـــۆ مـــە گـــۆت د ســـەدی هـــەڤدێـــدا
ب واریێ خـــۆ خـــۆڕی بـــۆ کـــوردا لێـــدا
((ئـــەز مامـــە د حیکمـــەتـــا خـــودێ دا
کرمـــانج د دەولـــەتـــا دنـــێ دا))

هـــەر دەقـــەبـــی و دگـــۆت ب دلـــێ مـــەغمـــووم[3]
ژیـــان ب خـــەمـــا بووراند مـــەلایێ[4] مـــەرحـــووم[5]
((ئـــەیـــا ب چ وەجـــە مانـــە مـــەحـــڕووم[6]
بالجوملـــە[7] ژبـــۆ چ بوونـــە مـــەحکـــووم[8]))

بـــۆ تـــە بـــەرســـڤا (صـــەدر)ی کـــادانی[9]

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٩٨٧/٧/٢١)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] ئەحمەدێ خانی، نقیسەر، فەیلەسووف و هەلبەستڤانێ کورد بوو، ل سالا (١٦٥٠) ژدایکبوویە، گرنگترین بەرهەمێن ئەوی داستانا ئەڤینداریا ب ناڤێ (مم و زین)ە، ل سالا (١٧٠٧) مالئاڤایی کریە.

[3] ب خەم.

[4] مەلا ئەحمەدێ خانی.

[5] مری، وەغەرکری، مالئاڤایی کری.

[6] بێ باهر.

[7] ب هەڤرا، پێکڤە.

[8] سزادای.

[9] مەلا سەدرەدین.

گەر نەیێ خەلەت بم سەیدایێ خانی
خلمەتەک مەزن بۆ کوردا دانی
نی تو هەر ساخی د دلێ کوردا دا

تو تانجێ سەرێ گشت شاعیرا بوویی
ڕێنیشاندەرێ شۆڕەشگێڕا بوویی
مەم و زینا خۆ تە هێلا و تو چوویی
دا کورد پێ کۆم کەن هێز و ئیمدادا[1]

ڕەحما یەزدانی بارانا تە بیت
عەرشێ ڕەحمانی سێبەرا تە بیت
باغێ بهەشتی بنگەهێ تە بیت
هیڤیا مە ل وێرێ ب گەهی مرادا

هندی کو ڕابن کورد هەوڵا بدەن
بکەن خەباتێ قوربانیا بدەن
وەک شێرا ب جەنگن ئالایا هەلدەن
ئێک نەبن[2] دێ شکێن د شۆڕەشادا

چونکە خیانەت ببیت هەڤالێ هەر چ ئینسانا
دێ دناڤ بەتن گشت هەوڵدانێت وان شۆڕەشڤانا
ئاشی کارێ وی چ جا ڕێک نابیت ب دوو ئاشەڤانا
هندی کو هەبن هەڤڕکی دناڤبەرا وا دا

ئەهریمەنێ[3] لەعنەتی توڤێ وی هەر خیانەتە

---

(1) هاریکاری.

(2) هەڤگرتی، ئێکگرتی.

(3) ئەهریمەن د ئایینێ زەرەدەشتیدا مینا (شەیتانی)یە د ئایینێ ئیسلامێدا.

چ بـەرهـەمـی نـادەتـن کـاری وی هـەر نـەدامـەتـە[1]
ئێك دوو بگرن کرمانجین ڕاست بکێشن هوین خەتە
دێ گـەن مـافێ خـۆ ب شـادی دوا چـار ئـەقلیمـا دا[2]

پاشـی ژیـر نـەکـەن مـافێ خـودایی سـەرێ ژوریـە ئـەو
خـەلـك دێ بێژیـت بـۆ دیـن و دونیـا چ جـامێرن ئـەو
مـەشـکا خـۆ نـەدەن دەسـتێ نـەیـارا (دونـی) بخـۆن ئـەو
خودا ڤرێکە بۆ مە ئیمدادا[3]مە ڕزگار بکە ل شیرێ جەللادا

ڤـەجـەمینـی مـە کـوردا ئـەمێـت کـەتـین کولانـا
ل وان هەلوەشینە(سێڤەر)[4] و (لوزان)[5] هەمی پەیمانا
کــەرم کــاری تــەیــە خــودانێ بــێ خودانــا
هێزێ ل خودایی دخازین ل وا کەین وەعظ و ئیرشادا[6]



---

[1] پەشیمانی.

[2] هەرێماندا.

[3] هەکاری، هاریکاری.

[4] پەیماناما (سیڤر) ل (١٠)ی ئاب سالا (١٩٢٠)ێ هاتبوو گرێدان..

[5] پەیماننامەیا لوزان، ل (٢٠)ی چریا دوویێ سالا (١٩٢٢)ێ هاتبوو گرێدان.

[6] بانگخوازی و شیرەت.

## گولا من یا تێنییە[1]

دێ تو بهەلێ بهەلێ ڕۆژێ
دا گول ڤەبیت ژ پژگۆژێ

گولا من بێ کەیف و کارە
ناڤ چیمەنا ب ژاری دیارە

کۆمەک سالا من گولەک چاند
ژ دل و ئەڤینی من خەملاند

گولا من یا پڕ بەهایە
لێ چەند سالە یا دامایە

هیڤی ژ خودێ بەلکو بدەت
بانێت بلند بێتن ڕەحمەت

باران باریت ب فەضل[2] و میننەت
ب کەیف وخۆشی گولا ئاڤدەت

بدەت سورگولا بدەتن بێنێ
بۆ مە هەمیا نەک بۆ من ب تنێ

ژ ڕەنگێ گولێیە کەیف و بێن بەلاڤ
گەر بێت ئاڤدانێ هەر دێ دەت خۆناڤ

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٨٧/٨/١٨)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) ب باشی، ب چاکی.

هەمی ئاڤدەن ڤێ سۆرگولێ
تیمار بکەن برین کولێ

بریندارا دڤێن دەرمان
گولا دڤێت خلمەت و ئاڤدان

دێ چێکەم باغێت گول و گولستان
سەخمەراتی تە دایکا کوردستان

## ل مە ئاڤا بوو ڕەوشا چرا[1]

گوهـ بدێرن دوست و برا
ل مە ئاڤا بوو ڕەوشا چرا

ئەو چرا ڤێ زەمانی
مەلا پیرێ[2] کورد کادانی

بارکر ل ڤێ دونیا فانی
ڕۆژا ل دینی بووی گرانی

وەفات و وەغەر کرن ل ئاکرێ بوو
ل گورستانا کێلا لاڤا نێشتەجێ بوو

بمە کربوو وەسیەت نامە
دوعایا خێر مە مەڕامە

گوڕێ وی ل سەرێ ڕێکێ
ڕێبوار بخوینیت فاتحەکێ

چ عالم و زانا بوو
ئایینخواز و ب تەقوا بوو

ڕاست صەریح[3] و زیرەك
ترسان نەبوو ل چ مێرەك

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٨/٨/١٩٨٧)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) مەلا پیر کو دبیتە مامێ هەلبەستڤان سەدرودینی، کەسەکێ زانا و ناڤدار بوو، ل ڕێککەڤتی (١٨ سبباتێ ١٩٨٧) مالئاڤایی کریە.

(٣) ئاشکرا.

کەسابەت و کارێ وی
پێشنڤێژ و وانەبێژ بوو

ژبۆ دیارکرنا ڕاستیێ
زۆر ئازا و نە ترس بوو

قایل دبوو خەلک ب وی
د فەتواندا پایە بەرز بوو

ڕۆژا ئاڤا بوویی چرا
غەم نیشیا هەمی درا

ب تایبەتی خەلکێ ئاکرێ
بگشتی مانە دل غەمگین

چوو سەیدا و زانایێ مە
چوو ڕۆنیا مە زێبارین

گەلی برا دەرمان سەبرە
مالا دوروست مە هەر قەبرە

هەمی دێ چین لێ نا مینین
چەندی بژین دێ هەر مرین

بگرن ڕێکا وان سەروەرا
گۆتنێت وان نەخشێ ل بەرا

ل دویڤ شیرەتێن سەیدایی
ئەی برایێت خوین شرین

علم نوورا خودایە
ب هەمی کەسا نەدایە

کەسێ خودا بۆ ڤیا
دێ کەت فەقیها((في الدين))[1]

خودا بڕێژی ڕەحمەتێ
مامم ببەی جەننەتێ

دگەل خودانێ نەزمی
گران بارێ (صدرالدين)ی

ڤەخوین ئاڤا کەوثەرێ
ڕۆگەش ببین مەحچەرێ

تەمام بکەیی نیعمەتێ
مە بەر نۆرا ئەنوەرین

هزار و چوار سەد و هەفت تەمام[2]
دەرچوو ل دنێ پڕ ژیر و فام

نوزدەیی جمادا دوو ئەز غولام[3]
(ئەرخت) کوچی (رحمة للعالمين)[4]

---

[1] د ئایینیدا.

[2] ١٤٠٧ك (١٩٨٧ز).

[3] ١٩ سبباتێ.

[4] ب دلۆڤانیه ژبۆ جیهانان.

## ئەگەرا ڤەمانێ[1]

ئـــەڤــرۆ ژینـــا ل مـــە کـــوردا بوویـــە هـــزرەت
ئەمێت کەفتین حالێ نەخۆش تژی ضەیقەت[2]

دگـــەل مـــە خـــارە خائینـــە دەولـــەت
ســـتاندی یـــە ل مـــە چ عـــزەت و کـــەرامـــەت

هـەرو پارچـەکێ ل کوردستانێ وێـران دکـەت
چـــەنـــدین ئـــاڤ و کـــانی دەرمـــان دکـــەت

کـــورد زوبـــان بـــۆ دەرڤـــەی وەلاتـــی دبـــەت
هـــیچ نینـــە کـــوردا چ ســـەربـــەخۆیی و حوڕیـــەت

کوردینـۆ مـەکـەن لـەومـەیـی زەمـانی قـەت
بنێـــڕن ل حـــالێ خـــۆ وەرگـــرن حیکمـــەت

گـــەر نـــەبـــان ل وە ســـتەم و عـــەیـــب و عللـــەت
چبـــوو گوننـــەهـــا وە پێکڤـــە بوونـــە عیبـــرەت

گەر موافـق بـن ل دیـن و موتـەفـق[3] بـن مللـەت
جهـ هـەبیـت د نـاڤ وە زانـین و ڤیـان و خلمـەت

دێ بـــن ل جیهـــانێ ئێکـــەمـــین دەولـــەت
((رغمـــا علـــی أنـــف العـــدی))[1] نـــە دبـــوو مننـــەت

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (٢١/٨/١٩٨٧)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] بەرتەنگیێ، دەستکورتیێ.

[3] هڤگرتن، ئێکگرتن و...

گەلەكا وەك من ل وە كرن شیرەت
وە هەر زیدە دكر خاری و خیانەت

ما بو چییە مال و زێر و زینەت
هوین پێ نە بەن ج مەفا و ئیسراحەت

بەس كەن هاریكاریا دوژمنی خسەت
خۆ نەفروشن بەسە بەندەیەتی و فورقەت[٢]

نە وەیێ نەبێژن نە باشە مللەت
ڕاستیە مرۆڤی دگەهینیت ڕێگەیی سەعادەت[٣]

بینن هزرا خۆ بۆ خۆ بكەن دللەت
چەند جارا وە دیتە كەفتن و ذیللەت

كورد خۆش میرن و خودان ئازایەت
جەنگاوەرێت خۆ ڕاگرن تو هێفكە ئایەت[٤]

هەژی وانە بزەی و زانین و درایەت
بزانن كا ژبەر چ ڤەمایە قافلەت[٥]

((وفق اللهم))[٦] كوردێت خودان غیرەت
بگەهینی دۆزا وان خودانێ ڕەحمەت

---

(١) سەر دفنا دۆژمنا.

(٢) كۆیلەیی و بن دەستی.

(٣) خوەش بەختی.

(٤) ئایەتا (١٦)، سورەتێ (الفتح).

(٥) كاروان.

(٦) خودێ سەربێخیت و هاریكار بیت.

بـــــەهـــــــرداربن ل دونيـــــا و ل ئـــــاخرەت
ڤـــەگرێتـــەڤـــە بـــۆ وان عـــزەت و كـــەرامـــەت

قەلـەمێ من چك بۆ نـەمـان فرمێسك[1] و خـەت
هـــــەر ئـــــەوە بـــــو پێنووســـــی عـــــادەت

ئـەز چبكـەم ل كـێ بكـەم داخـاز و مننـەت
گـەر بخـۆ شـارەزا نـەبـم ل كـار و صـنعەت[2]

بـــرايين بـــا بـــەس بيـــت ل ڤێـــره شـــيرەت
تكايە بير نەكەن (صەدر)ی ل دوعايا جەننەت

مێژوويا ڤـەهانـدنێ تـەباخـە مـەهـا هـەشـت
هـــزار و نـــە ســـەد و هـــەشـــتێ و حـــەفـــت[3]

---

[1] رۆندك، هێستر.

[2] پێشەسازی.

[3] ١٩٨٧ز.

## ل دینێ خۆ ئاگەهدار بن[1]

گەلی برا خۆ هشیار کەن
هەمی پێکڤە ب ئێك جاری
ئەمێت کەفتین داڤ و بەندا
گشت نەیار و شەڤێن تاری

کێمە دین مە کێمە ئیمان
کانێ عیلم کانێ عیرفان
هەمی برن خەلکێ بیان
هەوارا مە ڕەبێ باری

زۆرە کوفر و زۆرە ئیلحاد[2]
هەمی فسق[3] و هەمی ئیفساد[4]
نەزانینە و نەما ئیرشاد[5]
ڕۆژا ل مە کریە تاری

ڕەش بەلەکی دلەیزن
زۆربەی ل وان خار و دزن
زۆر ژی د مەست و سەرخۆشن
هەما ڤێکرا حەرام خاری

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٩٨٧/٨/٢١)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) بێ دینی، بێ باوەری و...

(٣) ژ دەستویر و فەرمانا خودێ دەرکەڤتی.

(٤) نەباشی.

(٥) نیشاندان.

سـيـنـەمـا و مـەيخانـە[١]
شـەڤ و ڕۆژێ شـۆلا وانـە
گرفتارێـت د مـەلهانـە
لـەوا ل مـە غـەزەب بـارى

نـە وان وەعـد و نـە پـەيمـانن
ئـەو نـەوەيـێ بـاش دزانـن
نـێ سـيخڕ[٢] و حيلـەبـازن
ژبـۆ پـارەيـى بـەرتيـل خـارى

بـو بـاش كـارا چـاڤ تارينـە
ژ بلـى خـۆ كـەس بـەرنينـە
لـەوا د سـاخن دمرينـە
كـو دێ بـار كـەن ل ڤـى وارى

ژ بـو پـارا ب حـەف حـەفـن
ژبـەر دينـێ خـۆ د ڕەڤـن
دويـڤ دينـارا ئـەو دكـەڤـن
ديـن لـێ بـر و سـەر لـێ خـارى

قـەبيـل ناكـەن چ شـيرەتـا
مـا دێ د هـۆ بـن هـەتـا هـەتـا
ئـەو مژيلێـت وان صـوحبەتـا
لـەوا نينـە چ گوهـدارى

---

[١] جهێ ڤەخوارنا عەرەقێ.

[٢] سويخور.

هەمی سەفیل[١] و مەغروورن[٢]
ب گوننەها د مەسروورن[٣]
تێر پارەنە هەر مەقهوورن[٤]
هزر ناکەن قەبرێ تاری

دونیا و پارە بێ فایدەنە
مە دوژمن هەر ئەهریمەنە
قارون و گەنج د بەرزەنە
نە دا فایدێ وی مال داری

بکەن تەوبە گونەهـ کارین
نێ گوننەها ئەمێت خارین
وەرن پێکڤە دا بکارین
بەری رۆژ چیتە ئێڤاری

ل دینێ خۆ ئاگەهدار بین
بۆ وەلاتی وەفادار بین
ئەڤیندارێت خاکا خۆ بین
بپارێزین ئەڤی واری

ب گەندەلیا گەلی برا
نابینین رۆناهی و چرا
هەلکەن گەل و پێکڤە چرا
دا ئاڤا کەین ئەڤی واری

---

(١) مرۆڤێ بێ بها.

(٢) دفن بلندی، خوە مەزنکرن و...

(٣) کەیفخۆشن.

(٤) شکەستی.

## نەصحەت بۆ کوردا [١]

گوهـ بدەن ڤێ شیرەتێ — دا ل وە بکەم نەصحەتێ
نەصحەتێ من ئەز غولام — بۆ کرمانجێت ئوممەتێ
بکەن خلمەتا تەمام — بۆ وە قەنجی پێڤەتێ
ڕاست بن هەمی خاس و عام — قەد نەکەن خیانەتێ
گشت وەڕا دێ بن غولام — گەر بکەن عەدالەتێ

خییانەت پیس و خەتەر — نادەت فەیدێ ئینسانی
گەر پێ بێتن زێڕێ زەر — تو هەر تێدا خۆسرانی
بۆ چ هۆ دکەی قوڕبەسەر — تو ژینا خۆ نزانی
تووی مرۆڤێ دەربەدەر — و جودا تە بۆ فانی

نزانی بۆچی هەیی تۆ — هەمی دەما تەپەسەر
ئەی دوژمنێ ژینا خۆ — تەم مەلیل و دل کەسەر
گوهبدە برایێ خۆ — خۆل بن دەستا بینە دەر

وەرە دەرێ ل بن دەستا — دێ بی خودان کەمالات
قەلەم بگرە ب دەستا — تەیارە دێ بن خەلات
بخوینە دێ بی هوستا — خەلات تۆب و عەجەلات
کوڕێ بابی نە وەستا — هەتا ڕزگار کر وەلات

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٩٨٧/٩/١٥)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

ڤەدگێڕی مێژو بۆ مە     دکەت مەدح و سەناتێ
ڕزگارکر وەلاتێ مە     دامە ئاڤا حەیاتێ
بلند کری سەرێ مە     ل ناڤ هەمی جڤاتێ
سەد ئافەرین لاوێ مە     کونە وەستای ل خەباتێ
جهێ تە ناڤ دلێ مە     شێر و پلنگێ لاتێ

## مه ژین نەمایە[١]

ئـــەڤـــڕو ژینـــا ل هــــەمـــی کـــوردا بوویـــە بـــەلا
کـــەفتـــین دەریـــا غــــەدر و ظولْمـــا بــــەر ســـیپەلا

مـــە مـــال نـــەمـــا مـــە حـــال نـــەمـــا بـــووین موبتـــەلا[٢]
بـــووین پـــەپیـــك و گلـــو گلـــو هـــەر دبێژین(لاحـــل)[٣] وەلا

گونـــدێت چیـــا خـــراب کـــرن ڤـــان فـــڕوك و قونبـــەلا[٤]
گونـــدێن دەشـــتێ وێـــران کـــرن بلـــدوزەر و شـــەفـــەلا

عـــەرز و عـــەیـــال زۆربـــەی بـــرن تـــەعریـــب بکـــەن ب تـــەشـــقەلا
بـــۆ باشـــووری عیراقـــێ ژی دنـــاڤ ڕەمـــلا وەکـــی پـــەلا

(صەدر) بێژیت ئەڤ قەوما وەو کولب و غەلا[٥]سالْا چەندێ چ محەلا؟
ل ئیلونا هەشتێ وحەفتێ پاش هزار ونە هسەدێ[٦] بۆ وە نقیسی مەلا

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٨٧/٩/١٥)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

[٢] توشبووی، گرفتار.

[٣] بێ چارەسەری.

[٤] بۆمب.

[٥] پەیڤەکا عەرەبییە ڕامانا گرانی ددەت.

[٦] ئەیلولا ١٩٨٧.

## بۆ بوهارا مە نەهات[1]

مـن خـۆ هاڤێـت نـاڤ دەریـا سـەر کـەلـەکـا
کـەفـتم پـێلا هـزر و بیـرا وەك گـەلـەکـا

مــن کــر کــارێ ئــەڤــان ڕاڤ و نێچیــرا
مــن دەســت هاڤێــت قــەلــەم جهــێ تیــرا

ئــەز گــەڕیــام ل ڤــێ بــەحــرا تــەکبیــرا
کـەلـەکـا مــن شــکاند خــودێ گیــرا

خــەیــالێ گــۆت هۆڤــە هــەڕە وێ هــە پیــرە
خــودان هــۆش و ســەرهــات و هــزر و بیــرە

لــێ بپرســە تــو حــەیــران و نــەزانــی
ڕێکــا ڤــین و ژیــانێ بــو تــە دانــی

مــن گــۆت کــالو ســلاڤا مــن ل ســەرتــە
بــۆ مــن بێــژە گــەر بــەرســڤم ل دەفتــە

چمــا بــەهــارا مــە نــەهــات زویکــا
نــە خــەملــی نــە کــەملــی وەك بویکــا

مــا ژبــەر چ ســەیــران نــەکــر زاڤــا و بویکــا
تــەڤــدا مانــە ژارۆ مــەلیــل وەك پــەپیکــا

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٩٨٧/٩/٢٢)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

پەیڤی وەرە مامو ل دەڤ من ڕوینە
ژ تەڕا بێژم دلێ من تەڤ برینە

تو بێژە من سەر و رە تە بۆ چ سپینە
ئو پشتا تە یا چەمیایی دێ بێن هەستی تێدانینە

دیر زەمانە هات بووم ڕاڤ و نێچیرا
ئەز کەفتبووم ڤێ دەریا هزرو بیرا

من خۆ نەکر خەوەکا خۆش ناڤ جەزیرا
ئەز تولاز بووم نهۆ دبینی کەفتم دەفتەرا پیرا

ئەگەر ئەوە ژ هەمی لایا خێل و خارین
دگەل بەهارێ نە عاشق و بەندە وارین

گەر وە دڤێت بەهارەك بێت
کەیف و خۆشی و موبارەك بێت

مێرگ و چیمەن بدەن گولا
ساخکەن گولێت هەمی دلا

دەستکێ(بقر)ی بکەن عیبرەت
بەرا هەمیا سەرێ وی کەت

بکەن عیبرەت گۆتنێت مەزنا
دا ل وە نەهێن شاخێت بزنا

مانە شەرمە گەلی برا کو ئەم د هۆ بین
وەکی (کەو)ێ ئەم (دارکوکێ) سەرێ خۆ بین

بکەن تەوبە ل خارەختا برا جانین
داکو بشێین ڤان ئەساس و بنەتارا دانین

ئـــەم ژی وەكـــی تـــەڤ مللـــەتـــا ئینســـانین
نـــە كـێـم تـــرین بـــەلـێ ئـــەم دبـێ خـــودانین

هـــەمـــی دكـــەن ب خوینـــا مـــە تجـــارەتـــا[1]
ئـــەمێت بووینـــە بضـــاعەتێـــت[2] ڤـــان مللـــەتـــا

بەسكەن ئێك دوو كوشتن بۆ (عەتف) خەتا
هـــەڤـرا چێكـــەن ســـەر ب خـــۆیی و ئـازایـــەتـــا

---

(1) بازرگانی.

(2) كەلوپەل، پەڕتال و...

## ڤینا وەطەن ئیمانە[1]

کەسابەت و کارێ من
کوردستانە پشتیێ من

زۆر گرانە بارێ من
هەمی وەرنە هارێ من

هەمی دەما ل هزرا من
ڕانا وەستیت زارێ من

گەلەك خۆشە وارێ من
بۆ د حەلێت جانێ من

زۆر پێ دهێت بێهنا من
بۆد بۆ هۆژیت دلێ من

تینیت مولکێ جیهانێ
جهێ کەیف و سەیرانێ

کەفتە بەر بوردومانێ
بێکەسێ و بێ خودانێ

دوژمنا هەمی سۆتی
خێر و چاکی لێ کۆتی[2]

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەفتی (١٩٨٧/٩/٢٤)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

(2) لێ خواری.

هـــــەمـــــی جهـــێ شـــێرانه
مێـــــرەك وا ب ســــەد مێرانـــــه

نـــاڤ ســـەنگـــەر و چـــەپـــەرا
خـــــۆڕاگرن ئـــــەو بـــــرا

بـــــەلـــــێ چبكــــەم بـــــرادەر
خــۆ ب خــۆ بوونـــه دوو ســەنگـەر

بــــەر ڤینـــــا مــــالێ دنـــــێ
كــــەفتنــــــه ســــەر خـــــارنێ

خارنـــــا پــــیس و چـــــەپـــــەلا
ژینـــــا ل مـــــه كریــــه بـــــەلا

كرمـــــــانجۆ بـــــۆ چ نزانــــــی
ل خۆنـــــا كـــــەی بـــــەڕەڤـــــانی

جـــانێ خـــۆ بكـــــەی قوربـــانی
ڤـــــی وارێ هـــــۆ یـــێ جـــانی

ڤینــــــــا وەطــــــــەن ئیمانـــــــه
كـــــارەكـــــێ زۆرێ جوانـــــه

شـــــیرەتـــا گشـــت چاكانـــــه
خـــــودان عـــــیلم و عیرفانــــــه

كــــاك و دا بچـــی جـــەننـــەتـــێ
تـــــودەربچـــــی ل میحنـــــەتـــێ[1]

گوهـــــ بـــــده ڤـــێ شـــــیرەتـــێ
بكاربینــــــــه غیـــــــــرەتــــــێ

[1] مسیبەت و نەخوەشی.

نەکە شەڕێ چ کوردا
خراب نەکە چ گوندا

شەڕی برای جەفایە[١]
نیشتمان هەر مەفایە

نەکە وەك جوێیت خەیبەرێ[٢]
ل خۆ بدەیی ضەڕەڕێ

ضەڕەڕ زۆرا خرابە
ل دین و دونیا عیقابە[٣]

گەر بکەیی ضەڕەڕا خۆ
خرابترین کەسی تۆ

((أظلم الناس))[٤] برا
ل خۆ بدەت ضەڕەڕ ئاشکرا

فەرمودەیا ڕەسولی
تو ژی ب ڤێ مەشمولی

ل خەو هەستە[٥] درەنگە
نێ تە نەما چ سەنگە

عالەم پرسی ل عەسمانی
تو هەر د کەیی گاڤانی

عالەم گەهشت ئەفلاکا[١]

---

[١] بێ دلوڤانی، دلڕەقییە.

[٢] جۆهییت خەیبەرێ.

[٣] سزا.

[٤] زۆردارترینی مرۆڤان.

[٥] ڕابە، هلو.

تو مژیلی ب چەلاکا

عالەم پرسی ل ستێرا
دستارێ خۆت نەهێرا

گەر ل خۆ نەکەیی تەکبیرێ
دێ کەڤی بنێ بیرێ

دێ کەڤی بەر بەلایێ
ڕۆژا تە چیت ئاڤایێ

گاڤ بۆ گاڤ و ساعەتێ
دوژمن چاڤێ ل فەرسەتێ[٢]

ڕزگار بوونت[٣] مەحالە
سزای ظولمێ زەوالە[٤]

خۆ دا بدەیی تەوفیقێ[٥]
مە بینی سەر تەریقێ[٦]

ڕێکا خودان غیرەتا
گوهداریێت جەم شیرەتا

ئاڤا بکەین ڤی واری
وەرگرین خۆدموختاری[٧]

---

[١] ئەسمان.

[٢] دەلیڤە، دەرفەت.

[٣] بوونا تە.

[٤] دویماهی.

[٥] سەرکەڤتنێ.

[٦] ڕێکێ.

[٧] حووکمێ زاتی.

## ئەی ئەڤینا مەم و زینا[1]

وەرە جـــارەك ئـــەی ئـــەڤینـــا مـــەم و زینـــا
بـــۆ مـــە بینـــە گـــولا ڤینـــا دل برینـــا

بكـــە چـــارەك ل ســـوڕان و ل بـــەهـــدینا
نـــوی ژەن بكـــە ڤینـــا فـــەرهـــاد و شـــرینا

ئـەی ئـەڤینا كـەفتـی دلـێ ئـەڤـی شـێخێ كـو صنعانی
ژبـەر خـاترا وێ كـچ فـەلـێ ل بـەرازا كـر گاڤـانی

د زاهــردا ببــوو عاشــق دل دەركــەتبــوو ژ كــاڤلانی
د بـاگن دا كـەڕامـەت بـۆ بنێـڕن سـڕا سـوبحانی

تـو ژی ڕابـە ئـەی ئـەڤینـا وان خـەجوك و سیامـەنـدا
ئەمێت كەفتین دەورەك نەخۆش نەما ژێرێ ئاقل مەندا

هەمی ڤێكرا بۆ مە ڕێكەن هەرچی عیشق و ئەڤینداری
بۆ كرمانجا زوی ڤڕێكەن بەری ڕۆژ چیتە ئێڤاری

داكو هەمی ڤێكڕا بكەن هاریكاری و هەوڵدانا
ب یەك گرتن ڕزگار بكەن گەلی كورد و كوردستانا

بێت مە گۆتین كەس ل وانژی كو نەگەشتە چ مرادا
دەولـەت سـەرێ وان بـەكـۆك و زێدە بـاری وا فـەسادا

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێككەڤتی (١٩٨٨/١/١٠)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

بەلێ ڤینێ هێلینا خۆ ل نیڤا دلێ ئەوان چێکر
هەردەم وا د گو یان وەسلەتە یان ژی قەبر

بلا بەس بیت برا کوژی بەس برێژن ل هەڤدوو خوینا
یێ نەهێلیت فێ عادەتێ ئێ خۆسارە ل هەردوو دنیا

## ئامۆژگاری ژ خەو رابن[1]

گەلی بەند و موسلمانا
گو بدێرن ڤێ شیرەتێ
شیعرە ظەریف[2] مە ژی دانا
کامل بگرن سەمعییەتێ[3]
بۆ وە هەمی موسلمانا
دین و دونیا کو پێڤەتێ
بگرن رێکا چاك ئینسانا
رێکا خێر و سەعادەتێ[4]
کار و عەمەل ب دل و جانا
رۆژەك دژوان یا ل دوی مە تێ
ب حەدیث و ب قورئانا
تەمام بکەن هوین خزمەتێ
ژ خەو رابن دونیا وارە
بنە تار مە ل قیامەتێ
وارێ مە هەر وارێ پارە

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٩٨٨/١/٢٢)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] نازك.

[3] گوهداریێ.

[4] خوەشبەختی.

کەس پێ نابەت چ ڕاحەتێ

کەسێ کری کار و عەمەل

د ڤێ ژینا سەر ساعەتێ

سەر بلندە کو هات ئەجەل

دێ کەفیتە خوش لەذەتێ

یێ مەغروورو نە هشیارە

نەکەت کارێ قارعەتێ[١]

ڕووسیاهـ[٢] و شەرمەزارە

ئاخ و ئۆڤی ژێ دەرکەتێ

خو هشیار کەن ئەی غافلین

بکەن جووت و زراعەتێ[٣]

هوین بچینن توڤی خاوین[٤]

پاڤێن جهێ صەلاحەتێ

مە چ چاندی درین ژ ویە

گاڤا کو هاتە حاسلەتێ[٥]

سزای چاکیێ هەر چاکیە

خودان سویچێن د محنەتێ[٦]

ژ خەو ڕابن موسلمانین

---

(١) قیامەتێ.

(٢) پەیڤەکا فارسییە ڕامانا ڕەش ددەت.

(٣) چاندن.

(٤) پاقژ.

(٥) بەرهەمی.

(٦) تەنگاڤی.

خەو غافلەتا شەقاوەتێ[1]

ژ خەو ڕابن یا حەیرانین

قافلەدەرکەت کەس ناگەتێ

کاروان دەرکەت بۆ لایێ باری

ب مەرەما تیجارەتێ[2]

طاعەت بۆ خۆ وا بژاری

شەڤ و ڕۆژا د خلمەتێ

خلمەت دکەن هەمی دەما

فایدێ مەزن بۆ پێ ڤەتێ

ڕەحما خودایی ل وان جەما

بوونە مێهڤان دجەننەتێ

د جەننەتێ بوونە مێهڤان

حور و لدان دخلەمتێ

تەجەللا کر خودای بۆ وا

زیدە باری هەر نعمەتێ

هەوار بۆ تە (صەدرودین) و

تویێ ڤەمایی ل قافلەتێ

تو هەسپەکێ چەلەك بینو

بارکە ل زادێ ئاخرەتێ

تو ژی بهێلە گران بارا

بگرە ڕێکا سەعادەتێ

بکە تەرکا خراب کارا

---

[1] نەباشی.

[2] بازرگانی.

بەرێ خو بدە صەلاحەتێ[١]

تەوبێ بکە ل گوننەها

بەری ڕۆژا مرنا تەتێ

دارا تەژی هشبیت ڕها

بەلگا تە ژی ب زەری کەتێ

بەری بێتن قاسدێ میر

تە دەربێخیت ل دەولەتێ

ئەو دەولەتا تو لێ ئێخسیر

ل کەس نەدا چ نەفعەتێ

فایدە نەدا ل زنگینا

چەوا ل مسکینێ ئۆمەتێ

خودا بدەیی مە مسکینا

ب لوتفا خو تو ڕەحمەتێ

دەستیر بدەیی خوشتقی خۆ[٢]

بۆ مە بکەت شەفاعەتێ[٣]

ل بن ئالایا ڕەسولێ خو

میلاکا خو بکەوینم ب شەریەتێ

خودا برێژە درود و سلاڤ

ل بەرەڤانێ ڤێ ئوممەتێ[٤]

---

[١] قەنجی و باشیێ.

[٢] پێغەمبەرێ خودێ (س،خ).

[٣] بەرەڤانیێ.

[٤] نەتەوە و مللەت.

## هندەك پەسنێن وەلاتێ مە[1]

گوهــدار بــبن ڤــێ وەصــفەتــێ
ل نـــاڤ وەلاتـــێ خـــۆ بـــژین
خــودێ دامــە جهــەكــێ خــۆش
مێــرگ و چیمــەن ئاڤــا شــرین
چیـــاییێن بلنـــد و داروبـــار
هــەمی كویستان هــەوای هــوین
نـــاڤ گـــەلیـــا و ســـەرێ چیـــا
هــاڤین هــەوارێــن خــەم ڕەڤــین
تـــــژی هــــەلال و نێرگــــزن
هــەمی تــەرزا مــە گــول چنــین
زۆرن گیـــا ل دەشـــت و چیـــا
دەرمــان دكــەن كــول و بــرین
ئـــاڤ كـــانییێن وەلاتـــێ مـــە
درێــژ دكــەن تــەمــەن و ژیــن
نیشـــتەجهـــێ پـــەز كویڤیـــا
پڵنــك و شــێر هــەر لــێ دژیــن
جهـــێ جـــووت و كشـــتوكالی
مـــە زەحفـــە دەشـــتا بـــەریـــن

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێككەڤتی (١٩٨٨/١/٢٤)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

مــه هــەر مێــرەك ب ســەد مێــرا
دەمـــا شـــەڕ ســـوپا جـــەمـــین
تـــو پســـیارکە ل نێـــرە شـــێرا
چ خـــۆش مێـــرن لـــێ نـــارەڤـــین
دلـــــێ وانـــــا دلـــــێ شـــــێرا
د شـەڕ و جـەنگا دەست هـەلین
بـــەر شــــددەت[1] و بـــەئســـا وان
ل دەولـــــــەتـــــا بژانـــــــدین
هـــەردەمـــێ کـــورد ببنـــە ئێـــك
پـــــەڕا ل مـــــــە دێ وەریــــــن
بـــلا بگـــرن کـــورد عیبـــرەتـــا
ل وا کـــەسێن بـــووین دوو جـین
ئێـك بـوون فـەرە بـۆ مـە کـوردا
دا ســـەر بلنـــد ئـــەم بـــژین
مخـــابنی مـــــە پێـــدا چـــوو
بـــۆ وێ خاکـــا زەر زێـــڕین
هـەنـە کـانی و دەریـاییێن بـۆش
ل کوردســـتانا نـــاڤ شـــرین
لـــێ مخـــابن گـــەلـــی بـــرا
ڤـان دوژمنـا ضـەبـط[2] کـرین
مــن دکــەربــا ئێــك نــەبــوونێ
کـــەفتنـــە دلـــی ســـەد بـــرین

---

(1) دژۆاری.

(2) دەستێ خوە سەردا گرتی، داگیر کری.

وەك گەلەكا مـن دا سەقا

ساخلەم نەبوون ئەو برين

مە كر پەسنا وەلاتێ خۆ

ل پەی دوزا ئیبنولئەمین

گەر تە دڤێ کورد بناسی

دگەل خاکا زەر زێرین

ناسناما وان بەرگێ وایە

ب جیهانێ ناساندین

ئێك دەنگیا دوست و دوژمن

ل سەر مێژوویا سەر هەلین

(صەدرودین)ی بۆ وە گۆتی

داهوین نەمینن سەرچەمین

دا لێ ڕابن خودان غیرەت

بۆ مە کوردا دەست هەلین

گوری کەن دل و جانێ خۆ

دا سەربلند هەر بژین

پەیدا بکەن لێ نانێ خۆ

زێری ب نەفتێ بکرین

نەبێژن تالێ و زەحمەتە

بکەن خەبات سەد ئافەرین

## نامەیەك[1] بۆ مەلا حاجی[2]

سـلاڤا مــن ل ســەر تــەبــی مــەلا حــاجی
پرسـیارام ژ حـالێ تـەبـی تـە ئـەحـوال چـی
دوعـا گۆمـە بـەهـر هـەبـی مـە كرمـانجی
د دنیـا و د ئـاخرەتـێ مـە سـەر هـەلـین

خـەمـا نـەخـۆ پـاڤێ ژ دلـی كـول و خـەمـا
وەیـە بـرا چ حـەسـیەت ژی بـۆ مـە نامـا
بـە لـێ چبكـەیـن دەرمـان ئـارام هـەمـی دەما
حـالێ مـژی حـالێ تـەیـە وەرە ببـین

تـو یـێ هـاتی تـە یـا هێلایـی (سـەرۆكـانی)[3]
داخـا نـەخـۆ دونیـا دەورە تـو ژی دزانـی
رۆژەك دێ هێـت بنـە تـارا ژ نـوی دانـی
گـەر بمینـین بڤـی دەردی نـە كـوزرین

گـاڤ و كاتـا خـەیـالا مـن لایـێ تـەیـە
دلـێ مـن ژی دگـەل ئێشـا دلـێ تـەیـە
وان زۆردارا دلـێ وان ژی نـەب مـە ڤـەیـە
هـەر خودایـە دەرمـان دكـەت دلێـت بـرین

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێككەڤتی (١٩٨٨/١/٢٦)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] مەلا حاجی عەلی عەبدولقادر، ل سالا (١٩٤٦) هاتیە ل سەر دونیایێ خەلكێ گوندێ سەرۆكانی سەر ب هۆزا زێباریانڤەیە، كەسەكێ زانا و شەهرەزا د بیاڤێ ئایینیدا، خانەنشینە ئاكنجیێ ناڤچەداریا دێرەلۆكێیە.

[3] گوندێ سەرۆكانی سەر ب هۆزا زێباریانڤەیە.

هیڤیدارین ژ دەرگاهێ خودا بکەت
دارێ خۆرتا ل سەر سەرێ مە ژێ ڕاکەت
شولا مە ژێ بنیڤا دلێ مە چێکەت
ل دەریا کول و خەما ئەم دەربچین

ئەم دەر بچین ل بەحرە هارێ
گولا بچنین ل ئادارێ
بدەین دەستێ وێ نازدارێ
بەلاڤ بکەت یا خەم ڕەڤین

فەلەک دگەل مە ببیت وەفا
زوی ڤرێکەت کەیف و سەفا
مە ڕۆناهی بێتە چەهڤا
وەفا دارتر ل مەم و زین

نازدارا مە کوردستانە
جهێ کەیف و یێ سەیرانە
ئەم بووین دەروێش و دێوانە
هەر دەمەکی ل جهەک دژین

ئەڤە سەرێ چەندین سالا
ڤەدگوهێزین مال و حالا
وەکی (کتکا) چیت هەفت مالا
مال و عەیال ڤەدگوهێزین

یاخودێۆ ل هەمی شولا تو قادری
ب تەمرینە خلاس کرین ڤی ئاگری
ئایەتا (یا نار کونی)[١] مە ژێ بگری
کانێ لاو و کانێ خاتین

---

[١] ئایەتا (٦٩)، سورەتێ (الأنبیاء).

خودان كەرەم دلى چ دڤێ
تودزانى مە ژ دل دڤێ
ڤە چەند سالە ئەمێ ل هیڤیێ
مە یا ڕێتى خوینا شرین

ئەى مەلایێ (سەرۆكانى)
نامەك بو تە ژ (كادانى)[1]
بیرە وە ریا ڤى كاروانى
ژ مەڕا بێژن (بعد حین)[2]

---

[1] كادان گوندێ مەلا سەدرووددینى یە.

[2] پشتى دەمەكى.

## هزر و بیرا ئەز پیر کرم[١]

هزر و بیرا ئەز پیر کرم
دێوانە و شەیدا کرم
ئەز پێچام د خەما وەرکرم
سەرگەردان و حەیرانم ئەز

کرمانجەکێ سەرگەردانم
گاڤ و دەما د هزرانم
ل پێش خەلکی پەریشانم
لەوڕا ناگرم گوشت و بەز

گوشت و بەزێت من حەلیان
پشت و ملێت من چەمیان
غەریبیا دەشت و گەلیان
وێران بوونە ل مە باغ و ڕەز

مە باغ و رەز وێران بوونە
ئاڤ و دەراف نخرو بوونە
مە چ دوژمن هۆنە بوونە
لەوا ب ئاه و نالانم ئەز

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٩٨٨/٢/٢٢)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

گەلێ کوردا ڕابن سەرخۆ
دەست و پییان بدەن بەرخۆ
کراسێ شەرمێ بکەن بەرخۆ
باغێت وە کا کانێ وە پەز

کانێ گوندێت ئاڤا و بوش
کانێ جهێت کویستان و خۆش
کانێ زەرییێن د پەردە پوش[1]
د حەیفا جاحێلانم ئەز

گرتن ئاگرێ تیرا قەزا
سۆتن وە کی باغ و ڕەزا
ژبەر ظولما وان نەحەزا
هەمی دەمێ تالانم ئەز

هەمی دەمێ ئەز تالانم
پەز پارییێ دەڤێ وانم
ئەز نێچرا فەنگا وانم
چ بکەم برا نزانم ئەز

چەکێ حەرام بکار تینیت
ژەهرا کوژەك ل مەد بارینیت
دا قڕانا[2] کوردا بینیت
پێنج هزار(حەلەبچە)ی بوونە غەڕەز

(قەرەداغ)[1] و چەند جهێت دی

---

(١) ڕاپێچان.

(٢) قڕکرن، بریاندن، ژناڤبرن...

ل بادینا هەرێما ئێك ئەڤەهە دی
کەس نا بێژی خوینمژ بەسە ئێدی
رێکخراوا مافێ مرۆڤ بریندارێ کێمیاوی ئەز

گەلی کوردا نابن سولتان
ئاڤا نابیت جهێ کوردان
هەتا هەنە دوژمن ل وان
سوپاس خودێ نەل وانم ئەز

هەرێ کوردین بەسە دیسا
نەکەن گوهدار هزرا پیسا
چ بەلایە ب وەڤە نویسا
عەجیب گرتیێ هەمانم ئەز

ژبەر کارێن دل قرێژا
تالان کار و دل برێژا
ڤان خائینێت خوین مە مێژا
چەندە سالە ڤەمامە ئەز

سیاسەتا وان تەفریقە[2]
(فرق تسد)[3] گۆت حەقیقە
ئەوان گرتی ئەف تەریقە
بەرێکانێ بۆ رێزن پەز

سەرحسێبا خوینا کوردا

---

[1] قەرەداغ دەڤەرەکە سەر ب پارێزگەها سلێمانیێ ڤەیە.

[2] دووبەرەکی، جوداکرن.

[3] سیاسەتا خوە سەپاندن.

ئاڤاهی هەن هەمی ئەردا
ئەوان فرۆت ملکێ کوردا
بلا نەبن دا بژیم ئەز

ما نوزانن هەر هۆ نابیت
ئەڤ دن هەمی بۆ وان نابیت
ڕۆژا وان ژی دێ ئاڤا بیت
دێ فەنابن هەمی نەحەز

ڕۆژەك دێ هێت ڕۆناهی بیت
ل کوردستانێ دێ شاهی بیت
عەسمانێ وێ پڕ ساهی بیت
ب هێزا خودێ دێ بینم ئەز

لێ شاعێرۆ بەسە بێژە
تە خۆ لال کر بۆ یێ گێژە
چیرۆکا مە یا درێژە
هێدی هێدی ڤەخوینم ئەز

هێدی هێدی دێ ڤەخوینم
شەڤ و ڕۆژا ل بەر ڕوینم
کولێت دلا دێ کەوینم
هندی ل دنێ بمینم ئەز

وەك دەلالا بکەم گازی
گەلی کوردێن ل ئەڤرازی
خۆ ڕێك بێخن دگەل بازی
هەمی ڕابن ب لەز و بەز

پێکڤە ڕابن گەلی شێرا
دریێ دانن وەکی مێرا

ژ مە كوردا ڕا تەدبیر خێرا
لێ ب هاوار و گازیمە ئەز

بلا ڕابن دگەل خۆ بینن
كوردا هەما ڤێك جەمینن
حەیفا مە ژی لێ بستینن
چاڤەرێنە گەلەك و ئەز

خاكا زێڕین پاقژ بكەن
سیخڕا ل ناڤ دەر بكەن
دوژمنا تەمبی بكەن
ب چاڤێت خۆ ببینم ئەز

ب هۆزانا چم وان دەڤەرا
ب شیرەتا هەرێم ناڤ سەنگەرا
كوردم بم ئەز یان مرنا پش چەپەرا
لێ دبێژم كو(سینگێ دینێ) وانم ئەز

## پیری و هزار عەیب[1]

وەرن گەل و ڤێ جڤاتێ
گوهـ بدێرن ڤێ صوحبەتێ
داڤە گێڕین ڤێ عیبرەتێ
ئەزم پیرێ ل کار کەتێ

سەردەمێ خۆ ئەز جەحێل بووم
سەر تاقەت و هێزێت خۆ بووم
بەرەڤانێ وارێ خۆ بووم
کەفتیمە دەورێ غارەتێ

هەکە لاوینی بێتە ڤە
من دووبارە نوی کەتەڤە
بێژم پیری تو دویر کەڤە
یان دێ ل تە کەم شکایەتێ

بێژم وەرە هەی جاحێلی
ئەڤا هەنێ یا هل هلی
دێ ڤەدەتن ل من کێلی
دەما کو ل من تو دویر کەتێ

من گۆت پیری تو وەنەکە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٩٨٨/٢/٢٥)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

ئــــەڤــێ هێـــزێ دەســـــت مـــــن نــــەكـــــە
چ ئاریشــــــــا تــــــو چێنــــــــە كـــــــــە
مـــــن نــــــە ئێخـــــــە ڕەزالــــــەتــــێ

وێ گـــــــۆت بخــــــودێ تــــــو چ نینـــــــی
تــــــە كــــــار نــــەكـــــر ب جــــاحێلینی
ســـــــەری ئـــــــەڤـــــرۆ نــــــا هــــــەلینــــــی
بـــــەفــــرا ســـــپی یـــــال ســـــەرێ تــــەتـــێ

ســــــەر و ڕهێـــــــت تـــــــە ســـــــپی بوونــــــە
ڕەش قـــــــەتڕانـــــــی بــــــــەلـــــــەك بوونــــــە
بنێـــــــت وان هـــــــەمــــــی ســـــــت بوونــــــە
دێ بـــــین خۆلیــــــا ب ســــــــەركــــــەتـــــێ

تــــــە چـــــاڤ ســـــەری ضــــــەعیـــــف بوونـــــە
دویرێــــــــــت تــــــــەژی نێزیــــــــك بوونــــــــە
دبێژیــــــــت ئێكـــــــی وێــــــت هـــــــە دوونـــــــە
وان مــــــــەرجانـــــــا عــــــــەڤـــــر كـــــــەتـــــێ

ل گوهــــــــێت خـــــــۆ یــــــــێ گـــــــران
دێ ئــــــــــــاخڤن تــــــــــــو نزانــــــــــــی
تـــــــو فێـــــــــری هـــــــــەوار هێلانـــــــــێ
ویــــــزە ویــــــزا ل گوهــــــێت تــــــە تـــــێ

ویــــــزە یــــــزێ هـــــــەر دوو دكــــــــەن
گـــــــۆت و بێـــــژا تــــــە دویــــــر د كـــــــەن
دێ بێــــــی بــــــەحســــــی مـــــــژی دكــــــەن
دل ئـــــــــــالوزی دێ ڕویـــــــــدەتــــــــێ

ددان دەڤــــێ تــــە دا نــــەمــــان
چــاوا دفــڕن کــەت کــەت ڤــەمــان
خــــەمــــا مــــەزن چــــاڤ و ددان
وێجـــــا دێ بینــــــی ذیللـــــەتــــێ

دەڤـــــێ تــــە ددان نــــەمانــــە
خــــارنێ نــــا ڤــــەهێـــــری مانــــە؟
ب تنـــێ یـــا ب تـــە مـــای زمانــــە
دێ بێــی خۆشـــی ل مـــن دویرکـــەتـــێ

پیـــــری ئێشـــــا زەحـــــف دکــــەت
ئێشـــێت گـــران پـــەیـــدا دکـــەت
بــــەژنێــــت بلنـــد خارفـــە دکـــەت
کـــو هـــزار خـــەش پیریـــێ ڤـــەتـــێ

نـــە شـــێی گوشـــتی ب هنجنـــی
نـــە شـــێی نـــانی ب کرچینـــی
((گـــەدە))[1] ژی وی نـــا حـــەلینـــی
بیـــت ئـــەگـــەرا ئێشـــێ ل تـــە تـــێ

ژیـــرا تـــە ژی ســـڤك دبـــی
ڕەفتــــار منــــال بچویـــك دبـــی
زوی عــــاجز و تــــویرە دبــــی
دێ بـــێن دینـــە ل وێڤـــەتــــێ

دەم ســـل دبـــی دەم ئـــاش دبـــی
دەم خـــراب و دەم بـــاش دبـــی

---

[1] مەعیدە.

هندەك دەما ژی شاش دبی
سەودا سەری هۆی داکەتێ

بێ نە فسی ژی هەر پیری یە
کو ئەڤە ژی کێما سی یە
بێ شەرمی ژی ئێکا دی یە
مرن هەبا پیری نە تێ

دوژینی و قرێژێ سۆت
دبێت فهێتە سەری بشۆت
ئەرێ پیرۆ تە ڕاست نە گۆت
دویرکە ڤە تو ل ڤێ عادەتێ

زیرەکی و جەگەرا شێرا
پیریێ ئەو ژی ل تە ڤەشێرا
تە ناڤ نەما ل ڕێزا مێرا
چوون ساڵوخێت ئازایەتێ

ژیلی هندەك گالە گالا
کو باخقی بۆ بەتاڵا
من هۆکر بۆ بەری ساڵا
سەر هاتیا بدەی جڤاتێ

بیر و هزر ل تە بری
چ سەربووڕا تو ناگری
بیرئین ل تە بێچار کری
دەوران بۆ تە ڕێ نا دەتێ

نابێم هەژی خویندن نینی
مادەم فەری کو بمینی
فەرە کو تو هەر بخوینی
شەهەرەزا بی ل دیانەتێ

چەرمێ لەشی تە تەنك بوو
خوینا لەشێ تە هشك بوو
بەهی و ڕۆژا تە ئاڤا بوو
لەو گەرم تێنێ نادەتێ

نێ شەهوەتا تە قەلیا
گێول و هەوەس ل تە بری یا
بەزێ تە ژی گشت حەلیا
نزیك پیری شەلەل کەتێ

یان شەلەلە یان لەر زوکە
ڤەڕەنگ ژینە نە خۆشکوکە
هێدی هێدی نوکە نوکە
وەی پیریێ بی فەرسەتێ

مایە کوپال نەکە سوئال
یێ ئارام بە بدە مەجال
ئەو ژی ل دوویا دێ بیت هەڤال
هیشتا مایە یا ب ڕێڤەتێ

چوك دێ ئێشن هوینك و بانە
ڕان دێ ئێشن بێ حەویانە
مل دێ ئێشن چ دەرمانە
پیریێ دەرمان چ لێ نەتێ

پشت دێ ئێشيت كەڤنە خەشە
ئێشانا وێ پرِ نەخۆشە
ژانا تێدا تە نە هۆشە
ئێش و نالێت لێ دەركەتێ

ل دەست ئاڤا يێ سستكرى
هەر چ گاڤا خۆ ناگرى
هەمى گاڤا رِێ ل بەرى
وەكى هەوارێ ل دويڤ تە تێ

دەم بۆ دەمێ زك چووى كرى
بى تاقەتى خۆ ناگرى
فێره ڤەمان ڤەهيل كرى
يێ خۆسارى ل ڤێ صوحبەتێ

زك گازندە و قورِ قورِكرى
بێ پشيى و بێن كورتكرى
حوير ڤەرِەس و زك شوورِكرى
وەى پيريێ بێ لەذەتێ

هندەكێت دى ئەم نا بێژين
يا فهێتە گەر ببێژين
پير دزانيت چ حالە ژين
رِەوشتا مەرِێ نادەتێ

سەر و چاڤێت تە تەبقين
هەر دوو پێيێت تە زەلقين
هەمى شۆلێت تە فستقين
رِەزێ تە ژى ئاڤ ناگەتێ

کورِ دێ چیتن کار بکەتن
یا پیری دڤێت وێ ناکەتن
هەر دوو ل وێرێ لێک کەتن
دکەربا زکێ پیری ئێش کەتێ

سەر و چاڤێت تە چورچ کرن[1]
برو ل تە درێژ کرن
گوهێت تە ژی پڕ موی کرن
ل تە چوو جوانیا ڕومەتێ

هندە جارا کوخ کوخ دکەی
ل پێشی چاڤا تو تف دکەی
تو چ ڕێزێ بۆ کەس ناکەی
نابێی ئەڤا بێز لێ ڤەتێ

سینک بلغەمێ دەماغ گلی
هەمی تێکدا یێ هل هلی
ل دەست تە چوو یا ئەوولی
بخۆ بگرە یال دوی تە تێ

کەسێ هەدار ب تە نامینیت
پیری هزرا بو تە دئینیت
ژ بلی ئەوێ ل نکتە د ڕوینیت
ڤەگێڕی ڕویدانێن سەرێ تەتێ

ڤێ پیریێ نە هێل کرم
دویر ژ شولا هەما کرم
دوست و برا ئەز بیرکرم
هەی لێ پیریێ قەباحەتێ

---

(1) قوڕمچینە.

تە نێزیکی مرنێ کرم
ژ هەڤالا ڤەدەر کرم
موسلمانم نە گاورم
ستەم کارێ بێ مروەتێ

پیریێ تو چەند ظالمی
تێکدا خەویش ل من هەڕمی
پشتا چاڤێت من وەرمی
خەو ناهێت و لەش با کەتێ

تو فێری ئێکا دیش کری
ب پور پور و گال گال کری
تو بێن کورت و خۆنا کری
ڤەرنگ پتر ل ژنا ڤەتێ

تە ماع کری تە تێ نینە
بەسە پیر و بخۆ ڕوینە
نوهۆ دەم وەکی جارا نینە
ئەو دەورەك بۆ ل تە دویر کەتێ

چ بێ شەرم و چ حیزە دل
ل من زیدە دکەت ئێش و کول
دگەل جاحێلا مل دەتە مل
دڤێت کارێت نە ژ بابەتێ

ڕاستە کو دبێن دل پیر نابی
هەرێ تەڕە ڕەزیل نابی
بەلێ ڕۆژا لێ ئاڤابی
پیری ڕێکێ هیچ نا دەتێ

هەچیا دبێم پیر دبێت وەیە
ئەڤە هەمی ل نك مەیە
هەمی وەنە هێش وێڤەیە
دێ باوەرێ بمە کەتێ

گەلی گەنجان و بچویکا
رێزێ بگرن ل ڕە سپیکا
وان نە مایە غێر هەستیکا
چەسپان دویری شکەستان کەتێ

رێز لێ گرتن فەرە بۆ وان
ئەمژی دێ چینە رێزا وان
زارۆیێن مە بکەن چاکان
هەکە مەرگ دەت مولتێ

ئەرێ پیرۆ سەر گردا نوو
ما بەس نەبی هەی نەزانوو
تو بێ هێز و خان مانوو[1]
ل گونەها بکە نەفرەتێ

دەما ژیان پێنچەهە بیت تە
دێ لاواز بیت گشت هێزا تە
دێ هێن گۆهرین ڕەفتارێن تە
هێدی هێدی تو دا کەتێ

دەما ل شێستا تە ژین جەما
ما وە تە چوو هەجەت نەما
پەڕەش ببووی خۆلك نەما
نیزیك ژینا ((نبی)) کەتێ

---

[1] ڕوی خۆش و دەنگ جوان.

هەکو ژینێ تە بۆ هەفتێ
وەکی ژینا ڤێ ئوممەتێ
گونەهـ زۆر بوون مینا شەتێ
هندە مرن یال دویڤ تە تێ

دەما بوویە هەشتێ سالی
سوپای ئێشا ل تە ئالی
هەڤالێن تە چوون وی ئالی
داربەستا تە نالێن کەتێ

دەما تو بووی نۆهەت سالی
وەك پەپیکا هەر دێ نالی
رێزیش[١] نەما ل دڤ عەیالی
بێهنا بیانیا یا ل تە تێ

ئەما کو گەهشتی سەدا
عزرائیل یێ دگەل تەدا
ل هەمی رێکا تە لێ ڤەدا
رزگار نابی پێدا کەتێ

رابە لەزکە ئێڤاری یە
سەرا بەفرە شەڤ تاری یە
دەمێ مرنا تە هاتی یە
بەسە بدەین تە مولەتێ

پەیامنێر هات موی یا سپی یە
بەلگا دارا تە زەر بی یە
بنێ وێ ژی کو رەش بی یە
دێ وەریێتن بایەك گەتێ

---

(١) رێز ژی.

دێ تو تاوانا بەس بکە
خراب کارا تو ڕەش بکە
پێر یا خراب یا باش بکە
ڕۆژەك دژوار یا ل دویڤ تە تێ

((خودێ)) بخۆ شەرمێ دکەت
پیر موسلمان سزا بدەت
ڕێکا توبێ بۆ تە ددەت
هاتی قاسدێ مەرگەتێ

هەچی ڕێکا بچیێ هەلەك
نژدەچینە ل پێشی تە گەلەك
خار و خۆیلن چەرخ و فەلەك
((عیزرائیل)) دێ سلاڤ کەتێ

((صەدرودین)) ی ئاشکرا کر
پەسنا پیرا و خەشێت وا کر
قیامەتەك ل پیرا ڕاکر
کەر بمینیت ئەودێ گەتێ

گەلی برا من وەلێکر
من بەیتەکا گرنگك چێکر
نەبێن ((سەدڕی) لەومە لێکر
من ڤەهاندی بۆ عیبرەتێ

ل نەهـ سەد و هەشتێ و هەشتێ پاش هزارێ[١]
من تەمەن گەهشت بو سیهـ و چارێ
پێنج ڕۆژ ما بوون بو ئادارێ
خودا شادمان بکەی مە بهەشتێ

---

(١) ١٩٨٨.

# هیڤی[1]

یا رسول الله یا هیڤی کارم
صەلات ل سەر تە گولی بەهارم

ئەزم گونەهکار گرانە بارم
ئۆمێدە من تو بکەی چارم

هەر تو هیڤیا گونەکارانی
هەر تو دەلیلێ هەمی ژارانی

مە کرن خەتا مە چ نەزانی
ئەم سەردا برین لەعین شەیتانی

ئەم مژیل کرین ب دونیا فانی
ئەم بووین سەفیلێت[2] ئەڤی زەمانی

خودا بۆ خاترا حەبیبێ سەروەر
ل مە ببووره خەتا ئۆ خەتەر

ل دەریا جەفا مە بینیەدەر
بو مە بکەی قەبوول هیڤیا پێغەمبەر

تو کەرەم بکە و بکە مننەتێ
ل مە هەژارا بکە ڕەحمەتێ

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١/٧/١٩٨٨)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

(2) خوەلیسەر، سڤك، نزم.

درێـــژ گـــوڕی دا نـــەبینـــە غـــەمبـــار
دەمـا بـن ئـاخ بـووین بـێ کـەس و بـێ کـار

ئـــەم دبـــین مێڤانێـــت دوپیشـــك و مـــار
ل مـــە تـــێن ڤێـــژی هـــەم ڤێـــری و هـــەوار

کـــوتێن دو مـــەلـــەك ب گـــۆت و پرســـیار
بـــەیانکـــە عـــەبـــدو تـــو دینـــێ نـــازدار

یـــاڕەب بڕێـــژە فـــەضـــل[1] و مننـــەتـــێ
بـــۆ مـــە هـــەژارا ل ڤـــێ ئوممـــەتـــێ

تـــو ڕزگـــار بکـــەی ئـــەهلـــێ زەحمـــەتـــێ
شـــەرمـــەزار نـــەبـــین ل عـــەدالـــەتـــێ

(موحـــەمـــەد) بکـــە وێ شـــەفاعـــەتـــێ
ببینـــە ئـــەهلـــێ خۆشـــی و لـــەزەتـــێ

ئـەم هـەمـی ڤێکـڕا بچـین جـەننـەتـێ
ل حـەوضـا کـەوسـەرێ ڤـەخـۆین شـەربـەتـێ

دال بیـر بکـەیـن هـەمـی تـالی[2]و زەحمـەتـێ
ببینـــە ئـــەهلـــێ وێ ســـەعـــادەتـــێ

درود و سـلاڤ بـلا ببـارن دگـەل ڕەحمـەتـێ
ل سەر (موحەمەد) ڕێ پاك ڤەژێرێ ئەڤێ ئوممەتێ

---

(١) باشی.

(٢) تەحلی.

## هەر قورئانە دەستوور[١]

سوپاس خودا تە ئەم کرینە مۆسولمان
ڤرێکری ب قورئانێ (موحەمەد)ێ ناڤ گران

هەر قورئانە بوویە دەستور بۆ مە هەمیا
بۆ مە دئینیت سەربلندیا دین و دونیا

ب قورئانێ مە رێ گرت و مە رێ ناسی
لەوما هیچ کار ل مە نابن گرێ و عاسی[٢]

نە هاتیە وەکی قورئان چ دەستورەك
نەهێلانە بۆ مە هەمیا کێم و زۆرەك

بۆ هەر کارەك نێ قورئانێ رێ ڤە ژێرا
بۆ مە دیار کر گشت ئەنجامێت شەڕ و خێرا

((فمن يعمل مثقال ذره خيرا يره))[٣] ناچیت بەلاش
((ومن يعمل مثقال ذره شرا يره))[٤] نابیت مەعاش

خودا بۆ خاتر ڤێ قورئانێ مینەت بکەی
تو مە کوردا ب ئاشتی یێ شادمان بکەی

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٩٨٨/١٢/١٥)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

[٢] ئاسێ.

[٣] هەر کەس ب ئەندازەیا (زەرەکێ) باشی کربیت دێ گەهیتێ.

[٤] هەر کەس ب ئەندازەیا (زەرەکێ) نەباشی کربیت دێ گەهیتێ.

# دینێ مە یێ ژار بووی[١]

گـــەلـــی بـــرا ئاگـــادار بـــن
فایـــــدە نینـــــە مـــــال و پـــــارە

ل دینـــێ خـــو هـــوین هشـــیار بـــن
مـــە دیـــن ئـــەڤـــرۆ بوویـــە ژارە

مـــە دیـــن ئـــەڤـــرۆ بوویـــە غـــەریـــب
کـــەفتـــی دەستێ گشـــت خـــەمـــارە[٢]

وان خـــەممـــار و مـــەی پـــەرســـتا
دینـــــێ عـــــەزیـــــز داب دولارە

ڤـــی ســـەردەمـــی هـــەچـــی کـــەســـێ
دیـــن پـــەروەر و طاعـــەت[٣] کـــارە

دەڤ نـــەفامـــا بکێـــر ناهێـــت
ئـــــەو مـــــوجرم[٤] و تاوانبـــــارە

بـــەرۆڤـــاژی هـــەر کـــەســـێ کـــو
وی هـــەلگرتـــی ڕیـــا خـــارە

د دونیـــــا و ئـــــاخرەتـــــێ دا
ئـــــەو مـــــوجرم تاوانبـــــارە

بـــرا نـــەچـــە وێ جڤاتـــا کـــو
مـــەی تێـــدا تێـــت ڤـــەخـــارە

نـــەچـــە مـــەلـهـــا[٥] نـــەگـــرە مـــەیـــلا[٦]
قومارکـــەر و گشـــت ســـەگســـارە

نـــەبـــی ئـــەڤـــرۆ شـــەڕت پـــارەیـــە
مـــالێ دنـــێ مـــە یـــێ زۆرە

بهـــەشـــت ئـــەوە یـــا ئـــەز تێـــدا
مـــە لـــەزەتـــا بـــێ قصـــوڕە[٧]

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەفتی (١٩٨٨/١٢/١٥)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) مەی (عەرەق) ڤەخوار.

(٣) تاعەت، عیبادەت.

(٤) گونەهبار، تۆهمەتبار.

(٥) جهێ خوە مژویلکرنا ب تشتێن نەباشڤە.

(٦) حەز.

(٧) پەیڤەکا عەرەبییە ڕامانا (کێماسی) ددەت.

نەبێ برا ئەز كەیفی مە — كەیفێ دكەم ب مالێ خۆ
سەرف دكەم ب هەر ڕەنگێ — بیت دویف زەوقێ خۆ

ئەز دێ هەرم چم — باژێرا سەیرانیمە
سینەما و مەیخانا — ئەز دێ گەرێم ژێهاتیمە

ئەی هەژار و هندی مالێ — كو هاتیە د دەستێ تەدا
خودان خودا تو وەكیلی — حسابدارە دگەل تە (خودا)

ب مالێ دنێ تو چ جارا — دل خۆش نەبە
بەهرا پتر (خودێ) دایە — نەیارێت خۆ مەغرور مەبە

فەرە برا جانم ل نعمەتا — سوپاسگوزار و خوراگر بی
سەرف بكەی ل ڕێیا (خودا) — شارەزا و چالاك داربی

بۆ خۆ بگرە عەزیزێ من — ژ هەمی لایان كەمالاتا[١]
ل دین و دونیا مەدح و سەنا — زێدەباری ڤان خەلاتا

---

[١] ژ هەمیان لایان بێ كێماسی بن.

## ژڤانێ دیتنا تەمە[1]

ئـــەڤینـــدارێ (خاكـــا) تـــەمـــە ســـالْ و دەمـــا
چاڤـــەڕێـــێ دیتنـــا تـــەمـــە هـــەمـــی دەمـــا
تـــویی دەرمـــانێ هـــەمـــی ئـــێش و كـــول و خـــەمـــا
بـــەلـــێ چبكـــەم بـــەخـــت طـــالع[2] مـــە ژی نـــەمـــا

بـــەخـــت و طـــالع مـــە ژی نینـــە (بـــاغێ دلان)
ئـارام و بـێن مـن نـەمـا نـە (شـاخ بلنـدێ لانـا پـەزان)
هیڤـــی دارم ل دەرگـــاهێ پـــاكێ یـــەزدان
ل ڤـــێ دنـــێ مـــە بێنـــە ڤـــە چـــەرخ و دەوران

بـــزەیـــی بكـــەت ب حـــالێ مـــە هـــەوا هـــوینێ
مـــە دەربازكـــەت ل دەریـــا بـــێ بـــن (ئـــاڤ شـــرینێ)
مـــە بگـــەهینـــت بـــەر ســـێبەرا دارا ژینـــێ
نـــەهێـــت دەردێ (مـــەمـــێ) ئـــالا و شـــرین (زینـــێ)

ئـــەڤینـــدارێ (چیاییێـــت تـــەمـــە پـــێ دل هـــوینم)
دێوانـــەیـــێ[3] (بـــاغێ گـــولا و میســـكا ژیـــنم)
دلســـۆتێی گـــەشـــتنا تـــەمـــە جـــەگـــەر خـــوینم
چـــەنـــدە ســـالە ل هیڤیـــا تـــە مـــە تـــە نـــابینم

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێككەڤتی (١٩٨٩/١/١٠)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] بەخت و ئیقبال، شانس.

[3] دین و شێت.

چەندە ساڵە دکەم خەبات و تێکوشانێ
هەمی هەول و هەمی هێزیش مژی دانێ
من ڤەژارتن دەحل و دڕی ل دەورانێ
دابێن کەمە گولا باغێ کوردستانێ

گولا باغێ کوردستانێ هەردەم بکەیف و کەنی
هەرا گەژە و بێن بەلاڤە خۆناف ئەنی
هەکە هات و من لێ چنی دێ بم خەنی
وەلات هەر تو جهێ ژینێ و خۆش مەوطەنی[(١)]

دەلالا من وان نەیارا کێڤە بری
برینداراا بێ دەرمان بوی تە بارکری
تەڤ عالەما ل ڤێ جیهانێ بۆ تە گری
هەیی هەوارە دلێ من سۆت ڤی ئاگری

سۆت دلێ من مێلاکا من بوویە دووکەر
دەما هاتی ژ مڕا کاکو نەخۆش خەبەر
دگاڤێدا ژ نوی جەمان تەڤدا کەسەر
دەمام دیتن شینەوار و هەمی ئەسەر[(٢)]

شینەوارو و کاڤلە گوندیش ڕەشی مابوون
گول و ڕیحان ل وارێ تە چرمسی بووون
گشت هەڤری و هۆگرێت تە مەلیل ببوون
پاش چوونا تە گوند کاڤل و وێران ببوون

---

[(١)] وەلات، نیشتیمانی و...

[(٢)] کارتێکرن.

ئـــەرێ جـــانێ پـــا تـــو كـــانێ تـــە نـــابينم
شـــەڤ و رۆژێ د هـــزر و بيرێـــت تـــەدا دميـــنم
ئـــەز گـــەلـــەكـــێ دل كـــەســـەر و دل بـــرينم
بـــەلـــێ چبكـــەم چيـــا دبلنـــدن تـــە نـــا بيـــنم

چيـــا يێـــت بلنـــد تـــەم و مـــژێ بـــەرزەكـــرن
ئـــەو ديمـــەنێـــت جـــان و شـــرين هنـــداكرن
رۆژ هـــات گيـــران كـــەڤـــر و نـــزار تـــارى كـــرن
شـاپێت بـەڤـرێ هاتنـە خـارێ گـونـد و گـونـدى بزركـرن

پـــەزێ مـــە مـــا بـــێ شـــڤان بێـــرى نـــەمـــان
جوتيـــار نيـــنن بچـــن جووتـــا هێڤـــڕان نـــەمـــان
بازرگـــانيش مـــە نـــەمانـــە بچـــن ســـويكان
هێـــرش ئينـــا ســـەر گونـــدێ مـــە وا نـــەيـــاران

ئاشـــێ مـــە مايـــە بـــێ دەنـــگ و ناڤـــەهێـــرى
بيـــر ئـــاش هـــەرفـــت گيـــوەرگيســـى ڤـــە نـــاگێرى
دولاب شـــكـەســـت كـــەتـــە ئاشـــێ نـــا زڤـــڕى
ئـــاش هوســـتايەك مـــە دڤێـــتن لـــێ بنێـــڕى

ســـــڤك وەرە دێ وەرە ل هيڤيـــــا تـــــە مـــــە
جهـــێ تـــو لـــێ غـــەريبـــى يـــە تـــژى خـــەمـــە
چ ئاشـــتى و ســـەر بـــەخۆيـــا نـــا دەتـــەمـــە
بـزەيـى بكـە ب هـەوالـێ مـن عـەنـدەليبـێ[١] بـاغێ تـەمـە

ئـــەز بلبلـــێ بـــاغێ تـــەمـــە ئـــەزێ ژارم
كـــەســـەر دارێ ژينـــا پـــار و يـــا پێـــرارم

---

[١] ناڤێ جۆرەكێ بالندەيانە و يێ دەنگ خۆشە.

بو دیتنا تە دنالینم دین و هارم
بەلێ چبکەم ئەزی ل ڤێرێ بریندارم

من دەنگ نەما بکەم هاوار بکەم گازی
من پەر نەمان بفرم وەکی بالێ بازی
من پێ نەمان چم زۆزانا ل ئەڤرازی
من جە نەما لێ دانیشم ببم قازی

گۆتم (کەوێ) بود هزرینی بێ گێولی[1]
بۆ چ نا خۆری نا قەبینی ژ کەیفا دلی
ئەم کەیفینە (هەیڤ) و (ڕۆژین) بۆچی سلی
ب قەبینە ل سەر شاخا وەك (بولبول)ی

ئەی (بولبول) و چووم سەر چیا ل زۆزانا
من خۆ بەردا کورگەڤزکا ناڤ شیلانا
چووم طەوافا بەژن و بالا نێرکز جوانا
ڕەش قلیا بوون چرمسی بوون بەلا هات بۆ سەرێ وانا

وەیە (کەوا) چیا وەیە
ئەوا دبیژی ل دەڤ مە هەیە
گولە زەرا ل ڕەنگێ خۆ یا تویرەیە
باغێ ئەز لێ گەلا ڕێزان ڕەش پوشەیە

ئەی بولبول و وەرە بۆ تە بێژم پەیڤان
هەڤدو ڤێکرا خۆ کەین ئێك دێ گرین پەیمان
ئەم ناخوینن نا قەبینین ل دەشت و چیان
تا ڕانەبن سەر ملێن مە خەم و خیال بارێت گران

---

(١) بێ زەوق.

نینه وەك تە ل دونیایێ دێم خۆناڤێ گولا سپێدا
چبکەم بۆ تە تو نەدیاری هەر دێ مینی د پەردێدا
نەهـ سەد و هەشتێ و نەهـ بوورین پاش هزارێ دقەیدێدا[1]
ڕۆژەك وەرە سەرەدانێ مە ئازا کە د حەبسێدا

دێ هنێرم دگەل (قولنکی) نامە و خەتێ
بدەت دەستێ خالا سیاهـ[2] ل رومەتێ
دا ڕابیت چارەکێ ژمەڕا سەحکەتێ
بەلەما ئازادییێ بگەهینیت لێڤا شەتێ[3]

پاپوڕ[4] دورست تەدارەك بیت ژ مەڕا بینیت
ل خار و چەپا بژارەك بیت بخەملینیت
ڤین و ڤیان سەر بارەك بیت دل ئەڤینیت
داکو بشێت ب هێزا (خودێ) ل دەریا جەفا مە دەر بینیت

(میم)ێ ل مە (سین)ی سلاڤ (عین)ێ ل تە
(واو)ێ وەرە (دال)ێ ئیمداد مەدڤێ ل تە
(صادا) صەدما ئەنفال دانا سەر گەلێ تە
(سالار) وەرە ئامادەینە ل هیڤیا تە

---

(١) د کەلامچێدا.

(٢) رەش.

(٣) ڕۆیبار.

(٤) گەمی، کەشتی.

## هاڤینا دژوار[1]

هــەی هــاڤینێ چــەنـد دژۆاری
ل مــــە داهـــاتی ل ڤـــی واری

ئـــەڤ وارێ مـــە فێنـــك[2] ببـــوو
هاڤینگــەهــەك لــێ گــەژ ببــوو

هــاڤین تــو ب گــەرمــا خــۆ ژی
ڤــی وارێ جــوان ل مــە د ســۆژی

ل مـــە قـــەلیـــان ڕەز و باخـــە
نــەمــا ل واری پــارەك[3] ســاخە

هــەی هــاڤینێ تــە بــۆ وەکـــر
ئــەڤ ئێتوینــە بــۆ مــە هــەلکـر

تــەگــەرمــا خــۆ ل مــەبارانــد
چ دوزەخـــــە ل مـــــە شــــاراند

بــایێ ســەمیــر تــە بــالا کــر
ب دەرد و ئێشـــــــا لالاکــــــر

تــە تــاوی کــر پــەزێ مــە ژی
تــە شــولوقاند[1] ل مــە مــەژی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٨٩/٨/١٢)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زیباریان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] هین.

[3] پارچە.

بۆچی هندە ب کەر مۆزی
دل ب کەسێ تە نا سۆژی

هێرشا پێشولە بێ سۆزا
پشتەڤانیا وا کەرمۆزا

ب سەرکێشا وا کەرمێشا
هەمی هاتن پێشە پێشا

سەوزەوات[2] و خاردەمەنی
ب گەرما تە بوونە گەنی

تە چللە ژی ل مە خەنزراند
تە عەنتەر ژی ل مە ئارزاند

هندی تێن هزر و بیر مە
نە دا هاتی هوسا تیر مە

هەی هاڤینێ ستەم کارێ
تو پلەکێ وەرە خارێ

نەداهاتیە هۆ ڕەنگ هاڤین
ل ڤی وارێ هۆ یێ شرین

نێ وارێ مە ب ناڤودەنگ بوو
بەلێ هاڤین ب شەڕ و چەنگ بوو

چ هاڤینەک ب تەم و تۆزی
ب گەردە لول و خودان دۆزی

---

(١) تێکدا، نێکهەلکر.

(٢) کەسکاتی.

هـــەی هـــاڤینێ هـــەتـــا کـــەنگـــی
ئـــەم دێ مینـــین ب ڤـــی ڕەنگـــی

تـــە ڕەش کـــرن دول و کوهســـــار
هشـــــك کـــرن ل مـــــە دار و بــــار

جــــوو و ڕیبــــار تـــــە هشــــکرن
بێـــرم و کـــانی تـــەگـــن کـــرن

کـــەوبارکێـــت مـــە زیبـــا[١] بـــوون
د دەرواری ڕوبــــــــا[٢] ببـــــــــوون

تـــــار و مــــــارپوون بژالـــــە بـــــوون
بـەشـێك ڕزگـار بـەشـێك دیـل بـوون

هـــــاڤین ب ڕەفـــت ئـــین پـــائیزە
بـــــایێ ســـــپێدا ڤیـــــزە ڤیـــــزە

کـــەوێـــت ڕۆبـــات[٣] یێـــت قـــەبیـــنن
ئـــەرغـــەنونـــا[٤] ژ مـــەڕا دخـــوینن

پێشـــول کـــەرمـــوز و کـــەرمێشـــا
واژگـــون بـــوون[٥] زك لـــێ ئێشـــا

ژبـــــەر بـــــایێ گــــــەلاڤێـــــژێ
دیســـا کـــەتنـــەف گێـــژە گێـــژێ

---

[١] جوان و لاو و ...

[٢] قەلەو.

[٣] ڕۆباد.

[٤] جۆرەکێ موزیکێیە وەك بزق.

[٥] پەیڤەکا فارسییە ڕامانا وەرگرەیا، تێکچوو و...

ته نەزانی هەر هۆ نابی
ڕۆژا ته ژی دێ ئاڤا بی

گێتی[1] هۆیه ب دەور و دۆره
دورا منه نەیا ب زۆره

ها در هاته گوهێت مەژی
پائیز هات و یاد گڕنژی

ئەزم پائیز بوهارا مێرا
دەمێ جووت و دەمێ گێرا

ئەز پائیزم هەوا گەشم
بۆ ڕێوێ زەمین زۆرێ خۆشم

ئەزم دەمێ دان قوتانێ
ب دستاڕی ڤەهێرانێ

کارێ خۆ بکەین بۆ زستانێ
دەمێ تەنگاڤ و بارانێ

ئەز پائیزم خۆشی ڕێژم
ئاشنایا[2] گلاڤێژم

(صەدر) بەسسە مەژی زانی
هەڕیین بەرا وی کاروانی

کاروان تێت و دلەزینیت
خۆ ب کەسیرکارا بگەهینیت

---

[1] پەیڤەکا فارسییە ڕامانا (دونیا، جیهان) ددەت.

[2] دۆست، هەڤال.

## ئەم ناوەستێین ل خەباتێ[۱]

ئــــەو بـــۆ هیڤیـــا مـــە بێچـــارا مـــە ب وێ هێڤـــی هـــەبـــوو
ئـــەو بـــۆ ڕێبـــاز بـــۆ مـــە هـــەمیـــا لـــەو نـــەیـــار کینـــە بـــوو

ئــەو بــۆ بــۆ مــە خــۆش خــەزینــە نــە پێتڤــی کــەســێ ئــەم
لــێ نــەیــارا کــرە تــەکبیــر ئــەو گــەنجــا مــە بــەرزە بــوو

ئــــەو بـــوو بـــۆ مـــە ڕۆنـــی چـــرا ئـــو شـــەمـــالا مللـــەتـــی
بـــەلـــێ لێـــدا بـــا و بـــاڕوڤێ ل هێـــزا وێ زێـــدە بـــوو

ئـــەو بـــوو بـــۆ مـــە جهـــێ ژییـــان ئـــو بـــەهشـــتا ســـەر زەمـــین[۲]
بـــەلـــێ چبکـــەم بـــۆ بـــە دوزەخ ژەهـــرا کـــوژەك بـــەهـــرە بـــوو

هنـــدی بێـــژن کـــەســـەك نـــادەت وەصـــفا جهـــێ کـــوردا قـــەت
تـــە چ دڤێـــت هـــەمـــی حاضـــر (خـــودا) نیعمـــەت زێـــدە بـــوو

ئـــەو بـــۆ جهـــێ ڕەز و باغـــا هـــەمـــی ڕەنگـــا فیقـــی هـــەیـــی
بـــەلـــێ خلمـــەت ســـەخبێرکـــرن ئـــاگر و هێتینـــە بـــوو

دێ ببـــــڕە ئـــــو نـــــەچینـــــە ل کوردســـــتانێ هاتـــــە جـــــێ
هـــەمـــی کاڤـــل ئـــو وێرانـــە کـــو چ دەورا هۆنـــە بـــوو

ئـــــەو بـــــۆ جهـــــێ پـــــەزی زەحـــــف ل کویســـــتانا دچـــــەرێ
ئـــەو ژی دوژمـــن کـــرە تـــالان ل پـــەزێ مـــە پالـــە بـــوو

---

(۱) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (۱۹۹۰/۱/۳)ێ، ل دەڤەرا (نەفتخانە- ئیرانێ) هاتیە ڤەهاندن.

(۲) سەر ئەردی.

ئەو بۆ جهێ چوار مەلیونێت[1] مە کرمانجا د(عیراق)ێدا پێ دژین
ب درێژیا سیه سالْ پتر سۆتن و برین دەر بەدەری و ئاوارە بوو
هیچ ناوەستین ل خەباتێ تا وەلات ڕزگار نەکەین
خەباتا مە چەند پیرۆزە ل ناڤ خودا و دەرڤە بوو
(صەدر) بەسە بۆ مە بێژە مە زانی داخازا تە
ڕێبازا خۆ ئەم نا هێلین گوهێمە ل گازیا تە بوو

[1] مەبەست ئامارا کوردێن عیراق یێن سالا ١٩٩٠ز.

## شەرمەزاری خودێ مە[1]

ئــەز بــەنــدەكــێ گونــەهكــارم
ڕێ دویـــرەكـــێ گـــران بـــارم
ل بـــەر خـــودێ شـــەرمـــەزارم
زۆرێ كــێمم بــۆ طاعـــەتـــی

طاعــەتــەك چــاك ژ خــۆ ڕا نــەكــر
ئاموژگـــارەك[2] قـــەبیـــل نـــەكـــر
ل گوننـــەهـــا توبـــە نـــەكـــر
خـــودا مـــن بینـــە ســـەر خـــەتـــێ

دێ چ بێـــژم یـــەزدانـــێ خـــۆ
دێ كێڤـــە دەم ئـــەز بـــەرێ خـــۆ
گاڤـــا مـــن دانـــا ســـەرێ خـــۆ
گـــو (ئیزرائیـــل) ل وێڤـــە تـــێ

ل وێڤـــە تـــێ ئـــەو نـــژدە چـــی
دبێـــت عـــەبـــدوو دێ كێڤـــە چـــی
چـەنـدی سـتویر بـی دێ هـەر پرچـی
نـــا دەمـــە تـــە چ مولـــەتـــێ

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (١٩٩٠/١/٥)ێ، ل دەڤەرا (نەفتخانە ـ ئیران) هاتیە ڤەهاندن.

(2) فێركار.

مولەت نینە كو هات ئەجەل
تە چ هەیە كار و عەمەل
ئەگەر چاك و ئەگەر دەغەل
پرس سۆئال ل دویف تەتێ

ئێك (مونكر)ە یێ دی ((نەكیر))
ئەون فەتتانێت گوڕێ كویر
ئەرێ بەند و تو یێ ئێخسیر
كەفتی چالێ ئو ظولمەتێ

كەفتم چالا مشك و ماڕا
مەلیل مامە وەكی ژارا
من بەردا قێری و هەوارا
چ ڕێ نەمان كەس من بەتێ

هاتن مەلەك ڕەش و چاڤ شین
د ترسا دا مامە غەمگین
ڕابە عەبدۆ نهۆ باش ڕوین
دەمێ پرسێ ل تە هاتێ

كیە(ڕەب)ێ تە كێ د ئەڤینی
كیە ئیمامەت سەر چ دینی
تو تابعێ چ ئەمینی
بەرێ خود دەێ چ قبیلەتێ

كینە خۆیشك و كینە برا
بۆ مە بێژە تو ئاشكرا
هەكە بەرسڤ تەدا ژخرا
تەگوڕ دێ بیت مێرگا جەننەتێ

(صــــەدر) بـــەسســـە بكـــە تۆبـــە
دێ مــــرى تـــو بـــەســــێ هۆبـــە
ل ئـــاخرەتـــێ تـــو گـــەش ڕۆبـــە
داكـــو بنيـــى تـــو نيســـبەتـــێ

## کوردینۆ[1]

کوردینۆ نانێ وە پاتی ب دەستێ خۆ
چ ویژدانە بکەنە دەڤێ دژێ خۆ
فەرە گەلۆ دەستێ خۆ بەن دەڤێ خۆ
سفرێ دانن ل سەر مێزێ ل بەرێ خۆ

کوردینۆ بۆچی دوژمن شیا مە
وی قەتاند و ب مە دارڕستن هریا مە
کرە کشتەك پێ گرێدا سەرێ مە
لەو خوینا مە ڕژییا سەر خاکا خۆ

کوردینۆ بۆچ جیهانێ دەنگ نینە
وەسا دا دنێن ڤی ملەتی ماف نینە
یێ بارکەفتی چ هەڤالەك وی نینە
دگەل خەلکێ بوونە دزێت مالا خۆ

گەر تو ببی تو پاشا و تێر ببی
نەکە حاشا ملەتێ خۆ ژبیر بی
دێ بێن خۆ نە ناسە چەند زیرەك و تو شێر بی
دەما لاددەی یی کو تو باددەیی ل هەژارا کەپێ خۆ

کوردینۆ بێژم بۆ وە هەمیا
هلۆن ڕاست کەن هەمی خاری و کەمیا
ڤێکرا بکێلن تەڤدا دەشت و زەڤیا
دا بەر خۆرێ زی هلینن تاجێ دانێن سەرێ خۆ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٩٩٠/٢/٢)ێ، ل دەڤەرا (نەفتخانە- ئیران) هاتیە ڤەهاندن.

کوردینـۆ گومـان نینـه کـو هـوین هـەمـی خـۆش مێـرن
بــۆ فـــەنگـــا خـــۆ د نێچیرڤـــان و ب ســـێرن
خـــەنجـــەر تیـــژن ل دیوانـــا لـــێ شـــێرن
بــۆچی کــوردین بــۆ دراڤـا وه بــەرزەکـر نــاڤێ خــۆ

کوردینـــۆ نـــه دووبـــەری ئێـــك ڕێبـــازێ بگـــرن
ئـالتونێ ڕەش[١] گـەنجینـەیـه کـانی هـەمـی ئـاگرن
بابـه گـوڕ گـوڕ[٢] مـەشـخەلـەیه خـەلکێ بخـۆ پـێ دخـۆڕن
ب تـــەماشـــا نـــابن پاشـــا بـــبن یارێـــت خاکـــا خـــۆ

بـــبن یارێـــت خاکـــا خـــودێ بـــن ســـەرێ مللـــەتـــا
همـــەت بـــێخن ملـــێ خـــۆ ((خـــودێ)) دێ دەت لـــەذەتـــا
خارنـــا وه بـــا خـــۆلی بیـــتن نـــەگـــرن ڕییـــا خـــەلـــەتـــا
نـــه ئـێخن مـــالا خـــەلکـــێ دەرگـــەهـــێ خـــانیکێ خـــۆ

کوردینـــۆ قـــەفتـــا شـــفکا نـــا شـــکێتن پێکڤـــەبـــن[٣]
دەســـتێ خۆرتـــا ناچیـــت تێـــڕا دێ پـــیلا و ئاســـن بـــن
لێکـك جودا کـەن هـەمی دێ شـکێن ب ساناهی لێکڤەبن
جویهـا فـگـرن ئێکـدوو گـرت و بـوون دەولـەتـەك سـەربـەخـۆ

نــه بــێن گــەلــۆ ب ســەخمــەراتــی هاریکاریــا عالــەمــێ
ئــەمــڕی ئێــك بــین دێ باســێ مــه ئــەوژی دەنــه قــەلــەمــێ
دوو ڕێبــاز بــین دریــژ ناکــەن ژ مــەڕا دەســتێ کــەرەمــێ
لـەو پاشـکەفتـین کـو هـەر ئێکـی تـەفشـی دانـا بـەرێ خـۆ

---

[١] زێڕێ ڕەش واته مەبەست (نەفت، پەترۆل)ە.

[٢] بابه گۆڕگۆڕ جهێ پەترۆلێیه کو سەر ب پارێزگەها کەرکوکێ ڤەیه.

[٣] مەبەست ئەگەر کورد ئێکگرتی و هەڤگرتی بین کەسەك نەشێت ئەوان بشکێنیت.

من هەوار و گازییە مللەتێ ژار تازییە
گرارا مە ناکەلیتن کوچکی ئاگر تێ نییە
دولابا ناچرخینیتن ئاڤا ل ئاشی گرتییە
دارا ژینێ کی دبینیتن نەزانا کر گوری خۆ

پیر و مەزنا ژ مەڕا دیاری ڤرێکر خەلات
ژیان دارەکە بەرز و بلندە د بێژنێ ئاوات
ژ بەرێ وێ ناخۆی سەر ناهەلینی بێ هەول وخەبات
دێ هوین هەول دەن دارا ئازادیێ ئاڤدەن ب خۆینا خۆ

مرن خۆشە ب سەربەستی نەکو ژینا ل ژێردەستی
کەس ب گوشتێ بەردانا نابیت تێر و بگریت هەستی
کەر ژی بێهنا بها ناکەت گەر جۆرێ وی تو ب پەستی
لێ شەڤامە چەند درێژ بیت دێ هێت ڕۆژا سەربەخۆ

دێ بلا نەبانە خۆزیکا نەبان سێ تشت ل ڤێ دنێ
پیری و بن دەستی ل هەر دووا سڤکتر دارا مرنێ
گەلا زەردبیت با دهژینیت دێ وەرهێت بنێ
دارا خۆزیا هەرا خڕشە نادەت بەرێ خۆ

کێ وە دیتە مللەتەکێ ناڤ نەبیت
کو یێ ساخە و دێ وی ل دنێ ژین هەبیت
یێ نەزانیت بلا بچیت سەرێ کەری ب ویڤەبیت
بلبل بەرگایی قەرەچ خاتین هەردێ خازیت نانێ خۆ

کوشـــتنا ســـەگـــەکـــی ل چـــول و غابـــات[1] بیـــت
تاوانـــەك گـــەورە ســـەرپـــێ جـــەلـــلاد[2] بیـــت
بـــەلـــێ مللـــەتـــەك بـــێ دەســـت هـــەلات بیـــت
بـــۆ ڤـــێ ڕویـــدانێ دەبـــی بنێـــڕن حـــوکم و یاســـاییێت خـــۆ

کوردینـــۆ چـــەنـــد بـــەرزەنـــە خۆشـــك و بـــرا و بـــاب و کـــوڕ
مـــە پـــەزێ بۆش بـــەس لێ مایـــە مهـــا لـــەنـــگ و گیـــسکێ گـــوڕ
پـــێش گـــورگـــی ڤـــە ڤـــەبـــەســـتییە شـــاخ مـــەزنـــە و گـــوشـــتێ ڤـــڕ
ڕاســـتی ب ئـــاگری ناســـوژیتن مـــن دەڤ تـــژی ئاڤـــە خـــۆ

مـــن بڕاســـتی تـــە بڕاســـتی ســـەرێ میـــری مـــە ژێ خاســـتی
نـــەك تـــو بخـــۆیی شـــەکـــر و شـــیری بـــدەیـــە مـــن ئاڤـــا ماســـتی
خـــەلـــك ئینـــا تـــە گـــوڤـــەنـــدێ دەســـتی هـــەمـــا بگـــرە بڕاســـتی
دیفتـــە شـــێخانیێ دێ کـــەن ڤـــێ دیلانـــێ ل وارێ خـــۆ

کوردینۆ مـــن کـــر بۆ وە هـــەمیـــا چـــەنـــد شـــیرەت و چـــەنـــد خـــەبـــەر
زێـــڕ ســـافی بیـــت چـــەوا دێ بیـــت ژەنـــگ و قرێـــژ کـــەڤنـــە ســـەر
ترســـیت ئـــەزمـــان ژ ددانـــا هـــەردێ بێـــژم یـــان ژیـــان و یـــان وەغـــەر
لـــەو دبێـــژم داکـــو ڕابـــن خـــودان غیـــرەت نـــەچـــەمیـــنن ســـەرێ خـــۆ

یـــێ بترســـیت زلکـــا مێشـــا هنگڤینـــی چوویـــە پـــاش
لـــێ نـــاخۆتن هنگڤینـــی ببـــەن خانـــا ســـم تـــراش
یـــێ نـــەگـــۆتی ل شـــەهیانـــا وەرنـــەگـــرتـــە چ شـــاباش
کوڕێ و ڕجا بابێ نەبیت چاوا دێ دەت بەر ئێکێ دی ملێ خۆ

---

[1] دارستان.

[2] ئەوێ سەرێ خەلکی لێدەت و دکوژیت.

کوردینۆ بەرێ کەربیت دێ شین بیتن دناڤ ویدا گیاو لەڤەر
چاوا تاڤێن مەشکا خەلکێ بەندکێ خۆ یێ سۆر و زەر
شولێ خەلکێ ئاڤا سەلکێ ڕاست وا گۆتی ئەف خەبەر
هیڤیا دەرا خۆلیا ب سەرا هوین شرین کەن تاما زای ب ڕەنجا خۆ

بە لێ چ بکەم وەکی یێ چووی بریم زالا[(١)]
ڤەگەریاڤە ب وان دلا یێ دەست ڤالا
چەوا دڕێسم وەسا بادبەت دەڤ شەگالا
چ بکەم گەلۆ ڕێکا ژینێ هەمی کەسا نەدا بەر خۆ

کەنگی دبیتە ماستێ تازە شیرێ دوتی بێ هێڤێن
کەنگی دزانن قەدرێ پییا یێت سەردەستا نە گەڕێن
گەر هوین نەکەن ب گۆتێت مەزنا شاخێت بزنا دێ ل وەهێن
گەلی کوردا ئەز ماندی بووم ب وەڤە هێرو گێژو ڤێژکر سەرێ خۆ

کوردینۆ مە کوردستان مل کاریتە کەفتیە بەر
فەرە هەرکەس ملێ خۆ ژی بدەتە بەر
دا نەمینیت ل ڤێ ئەردێ کراسێ ڕەش بێتە بەر
یا فهێتە هوین زامداری سەردا پاڤێن بازا خۆ

ئاڤا بشدیێت ناف تەنگاڤێ دەنگ لێدانا وێ فەرە
کەو دڤێتن خەو دڤێتن نەهۆشیاری وەك کوژا وی فەنەرە
ئالایێ کوردا بچقینن نیشانا مە خەنجەرە
شەڤ چەند ب درێت ڕۆناهیێ ڕۆژ دێ هەلدەت سەرێ خۆ

---

(١) بریم زالا؛ ناڤێ گوندەکی یە.

ناســــنامامه ل جیهـــانێ (مصــــطهفـــا)یێ[1] بــــارزانی
شـــێرێ بیشـــا پلنگـــێ چیـــا پـــڕ وەفـــا و ڕێزانـــی
تــو مــەلا و تــو ســەرکــێش بـۆی ل دیــن و دونیـا تــەزانـی
هزار رەحمەت ل گورێ تە ئەی خەمخۆر و زەحمەتکێشێ گەلێ خۆ

دێ هـــــــەر بێــــــژم دێ ڤـــــــەهـــــــوینم
ئاشـــــــــێ خـــــــۆ ژی دێ گێــــــــــڕینم
مـــــــەتـــــــەلوکـــــــا ژ وا ڕا ئیـــــــنم
هـــەتـــا بارکـــەت (صـــەدر)[2] ب هێلیـــت وارێ خـــۆ

---

[1] مەلا مستەفا بارزانی ل (١٤ ئادارا ١٩٠٣)ێ ل گوندێ بارزان هاتیە سەر دونیایێ ب ناڤدارترین و مەزنترین ڕێبەرێ تەڤگەرا ئازادیخوازا کورد دهێتە هژمارتن، گرنگترین خال د ژیانا بارزانیدا چوون و زڤرینا ئەوی ژ ڕووسیا (١٩٤٦-١٩٥٨)ێ و ڕێبەریا شۆڕەشا ئەیلولێ (١٩٦١-١٩٧٥)ێ بوو، ل سالا (١٩٧٩) مالئاڤایی کر.

[2] مەبەست مەلا (سەدرودین)ە.

## لەوما ڕێکخراوا مافێ ئینسانی[1]

یا خودێ تو خودانی
تو حالێ مە باش دزانی
ل مە سۆتن مال و خانی
هەڤشاندن ئاڤ و کانی
تو زۆردارا لێ نە هێلە

بەلاڤکرین سەر بیانی
هەمو هێلاین بەیابانی
وان ڕاکرن کوفرستانی
کەسێ نەکر بەرڤانی
هەمیا ل مە کری فێلە

نەهۆشیاری د خەوانی
ڕێکخراوا مافێ ئینسانی
ل مە ناکەی بەرەڤانی
هۆ بێ بەختا ڤی زەمانی
گشت کارێت تە شێلە و پێلە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩٠/٢/٢)ێ، ل گوندێ (نەفتخانە ـ ئیران) هاتیە ڤەهاندن.

## شەرط دینە نەك جوانی[١]

هەڤالا گۆت جوان فینوسە
ڕویمەت ڕۆگەها[٢] قوبلان[٣] و بوسە

من گۆتە وانا قەد وە نینە
جوانیا بێ دین بەها یەك نینە

ئەصل و نەسەب[٤] مال و جەمال
ئاڤێن شیلی ناکەن زەلال

وەها هاتیە ب حەدیث[٥] و ئەسناد[٦]
شیرەتن گوهـ بدەن ئیرشاد[٧]

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩٠/٢/٢)ێ، ل گوندێ (نەفتخانە) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) قیبلە.

(٣) ماچ.

(٤) ڕە و ڕڤشت.

(٥) فەرموودە.

(٦) بەلگەنامە.

(٧) نیشاندان.

## ڤەپارین ژ خودێ[1]

ئەی خودانێ عالمێ    چێکەری ئاسمان و زەمین
تویی خودانێ ملکێ چیهان    تو خودانی کەس چنین
توی چێکەرێ جن و ئینسان    ژ ڕەسەنا وان ئاگر و طین[2]
بۆ تە طاعەت جێ بە جێ کەن    دگەل فریشتانێن ئەنوەرین

ئەی خودانێ کورسیا بەرین[3]    توی شاهین شاهێ[4] عالەمێ
ئەی خودانێ شەڤ و ڕۆژا    ب ستێرا نیشان دان عالەمێ
تە گوهرین دا شەڤ و ڕۆژا    ژبلی تە هەمی دێ چن عەدەمێ[5]
بەندێ تەمە یێ هەژارم    (خودا) دێ نە هێلە ڤێ غەمێ

ئەی خودانێ حەشەرات و    چەند تە ئافراندین مار و موور
ئەی خودانێ وەحش و تەیڕان    دەشت و چیا و ئاڤێن شرین و زوور
توی ڕازق بو مە هەمیا و    نینە ژ تە کێماسی و قصوور
هیڤیدارم ل تە یەزدان    من عەفوکە تو ل من ببوور

ئەی خودانێ ئاڤێن تەزی و    چەندی هەنە گەلی و دەریا و شەت
ئەی خودانێ بەیابانا و    چەندی هەنە دول و نەهال و خەت

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩٠/٧/٢٩)ێ، ل وەلاتێ (کۆیتێ) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) تەقن، هەڕی.

(٣) عەرشێ مەزن.

(٤) شاهێ شاهانی، مەلکێ مەلیکانی و...

(٥) نامینن.

ئـــەی خـــودانێ بـــاو باڕوڤـــا و　　چـــەنـــدی هژیـــانێن ب شددســـەت[1]
ب هێـــزا خـــۆ مـــن دەربـــازکە　　ئەزم تەیرێ کەتیم داڤێ بکە قەت

ئـــەزم تـــەیـــرێ کـــەتـــیم داڤـــێ　　مـــەلویـــل مامـــە ل بـــەر تـــاڤێ
دێ مقـــەســـا ڕەحمـــێ بـــاڤێ　　ب قـــەتینـــە ئـــەڤـــێ داڤـــێ
مـە خـۆش دل کـە ئـەوێ گـاڤێ　　ل مـــە ب ڕەشـــینە گـــولاڤێ
ل دیـــن و دونیـــا مـــە ڕزگـــار کـــە　　تـــو نـــەبێـــژە مـــە تـــو نـــاڤێ

---

[1] دژۆاری، تۆندی.

## چ خۆشی مه نه دیتینه[1]

هه‌ڤال چه‌ند سالێ ل مه بوورین    چ خۆشی مه نه دیتینه
ده‌مێ مه دگو ئه‌م بسپوورین    هزر و بیرێت مه تیژ بینه
مه هه‌ر دیتیه کو خه‌مخورین    ل چ ئه‌ردا نه نیشتینه
چ بکه‌ین نێ ئه‌م د مه‌جبوورین    فه‌له‌ك دگه‌ل مه یا خائینه

چه‌ند سالێ شه‌ڕ بوو ل کوردستانێ    هه‌مێ ده‌ما تالان بینه
مێژی ل مه بر بوردومانێ    مال و گوندێت مه سۆتینه
دویڤ هات جه‌نگێ دگه‌ل ئیرانێ[2]    چ ئاسایش که‌س نه‌بینه
ده‌رفه‌ت نه‌دا ڕاوه‌ستانێ    پاشی تویشی ئه‌ڤێ بینه

توشی جه‌نگێ که‌نداڤێ بووین[3]    ته‌ڕ و هشك تێ سۆتینه
سێ ده‌وله‌تێن ل مه ڕابوووین    ڕه‌خ و چانێت مه گرتینه
هه‌ڤال نهۆ ئه‌م ژی تێچووین    نهۆ ئه‌م ل خۆ هه‌ر بێهیڤینه
خودا ئه‌ڤرو ئه‌م بێ ڕێ ماین    ل ڕه‌حما ته ئه‌م ب هیڤینه

ل کۆیێتێ مه جێ گرتن    د تابیادا ڕوینشتینه
دوژمن هه‌ر جه‌ند گه‌له‌ك خۆڕتن    به‌لێ مێرا ڕه‌ڤین نینه
گه‌لی برا هوین نه‌ترسن    به‌رخێ نێر بۆ سه‌ربڕینه
گه‌لی مێرا کو هوین کوردن    ((سلیمانی)) و ((زێباری))نه

---

[1] ئه‌ڤ هه‌لبه‌سته ل ڕێککه‌ڤتی (١٩٩١/١/٢٠)ێ، ل وه‌لاتێ (کۆیێتێ) هاتیه ڤه‌هاندن.

[2] جه‌نگێ دناڤبه‌را سالێن (١٩٨٠-١٩٨٨)دا بوو.

[3] ١٩٩١.

شەڤ و ڕۆژێ هەزار غارە        بالەفڕا ڕاکرینە
ڤان دەولەتا کرە کارە        ئستولێت[1] خۆ کێشا بینە
د بەرپێ[2] دا جەنگ دژوارە        مە چووك ئەردی چقاندینە
شەڤ و ڕۆژێ مە ئینزارە[3]        چ بێندانەك مە ژی نینە

((ڕەمەزان))[4] و خەما نەخۆ        پشتی نەخۆشیا خۆشینە
گران نەکە تو بارێ خۆ        زوی ئەڤرۆکە دەست هەلینە
دبێژن ڕەشو تو ب دەستێت خۆ        هەوجەی نەمەردی نە قەد نینە
یا مای ئەم و ڕەش بەختێ خۆ        ب کارێت خودێ ئەم ڕاضینە

بۆ مە بیتە یادگاری[5]        لەوما((سەدڕ))ی نڤیسینە
دەمێ ئاگر ل مە د باری        موشەك ب ڕەخێت مە کەفتینە
سەرسوڕمامە ل ڤی کاری        کوفر و ئیسلام تێك هەلبینە
هیڤیا مە خالقێ باری        ژبلی وی مە چ کەس نینە

---

(1) کۆمەکا گەمی و پاپۆڕان.

(2) هشکاتیێ.

(3) هۆشداری.

(4) مەلا ڕەمەزان موحەمەد عەزو، ل سالا (١٩٥٥)ێ هاتیە ل سەر دونیایێ، خانەنشینێ پەروەردێ یە و ئاکنجیێ باژێڕێ ئاکرێیە.

(5) بیرهاتن.

# ئەی ڕۆژێ[1]

ڕۆژێ وەرە دەر مە بکە ڕویێ خۆ
دا بۆ تە بێژم دەردێ دلێ خۆ

دەردم گرانە دەرمانە چ نینە
دلم پڕ ئێشە هەمی برینە

کوردستان گشتی کاڤل و وێرانە
سەردا ناچیت ڕۆژ بێ بوردۆمانە

ئەیی ڕۆژێ تووی سەردارا ستێران
بۆ من بەیانکە ژینا مە کوردان

ل کوردستانێ چەندی تە دیتی بێژە بۆ کوردا
داکو ل بیر نەکەن ڤان ئێش و گشت کول و دەردا

تە چەند دیتینە لا شێت جاحێلان
تەڤدا وان جیهان لێ بۆ تاریستان

تە چەند دیتینە چاڤێت بگریان
هەر دەم ل ڕێکا گور و گوڕستان

تە چەند دیتینە شەهیدێت کوردان
کفنێ خۆ ڕەنگدا ب خوینێ ئەوان

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٩٩١/١/٢٠)ێ، ل وەلاتێ (کۆێتێ) هاتیە ڤەهاندن.

تـــــه چـــــهنـــــد ديتينــــــه شـــــارێت بوردومــــــان
زۆربـــــهيــــى گونــــدێت مــــه كاڤــــل و وێـــــران

تــــه چـــهنـــد ديتينـــه چـــووين بـــێ ســـهر و شـــوێن
چ جـــــا ســــاخ نـــــابن ل مــــــه ئـــــهو بـــــرين

تـــــه چـــــهنـــــد ديتينــــه شــــوخ و نــــازهنــــين
ذهليــــــل و مـــــهليــــل مــــات و حــــهييـــــرين

تــــــه چـــــهنــــد ديتينــــــه مـــــال و خانــــــهدان
هـــــهمـــــى وێـــــران بـــــوون تــــهرشـــــێ وان تــــالان

تــــه چـــــهنــــد ديتينــــه عـــــهگيـــد و مێـــــر چـــــاك
هــــــهمـــــى فــــــهنـــــا بــــوون چوونــــه ژێــــرى خـــــاك

مـــــــهلا (مصـــــــطهفـــــــا) و قـــــــازیێ[١] ئيرانــــــــى
شــــــيخێ حــــــهفيـــــــد[٢] و شــــــێخێ پيرانـــــــى[٣]

شـــــيخ عـــــهبدولســــــهلام[٤] دگــــــهل بـــــهدرخــــــانى[٥]

---

[١] قازى مهحهممهد، دامهزرێنهرێ كۆمارا كوردستان(١٩٤٦)ێ بوو ، ل (٣١ ئادارێ ١٩٤٧)ێ ل مهاباد هاته سێدارهدان

[٢] شێخ مهحموودێ بهرزنجى (مهلك)، پشتى چهندين سالێن تێكۆشانێ، ل سالا (١٩٥٦)ێ مالئاڤايى كر.

[٣] شێخ سهعيد پيران ل سالا (١٩٢٥)ێ دژى دهولهتا توركيا يا ئهوى سهردهمى ل ئامهدێ شۆڕهشا خوه دهستپێكر، لێ ههر د سالا ناڤبرى دا شێخ ل گهل هەڤالێن خوه دهێنه سێدارهان.

[٤] شێخ عهبدولسهلام بارزانى، دناڤبهرا سالێن (١٩٠٧-١٩٠٨)ێ، دژى دهولهتا عوسمانى شۆڕهش كر، ل سالا (١٩١٤)ێ، ل مويسل هاته سێدارهدان.

[٥] مهبهست ئهمير بهردخان ژ جزيرا بۆتانه كو دناڤبهرا سالێن (١٨٥٢-١٨٥٥)ێ دژى دهولهتا عوسمانى شۆڕهشكر.

شێخێ نەهری[1] و ڕزایێ نۆڕانی[2]

خودا ببارینە ڕەحمەت و عیدا
ل سەر مەرقەد و کورێت شەهیدا

ڕۆژێ وەرە دەر ل مە بکە ڕێ خۆ
دا بۆ تە بێژم دەردێ دلێ خۆ

تە چەند دیتینە بێکەس و هەژار
ژینا ڤێ دنێ لێ بووی ژەهرە مار

تە چەند دیتینە گول و گولستان
ڕەش و چرمسی ل چیایێت کوردستان

تە چەند دیتینە چەند شەڕ و دەعوا
چەندین ناخۆشی هاتینە سەر وا

تە چەند دیتینە کوردێت دەربەدەر
خزم و کەس و کار ل ئێک بێ خەبەر

تە چەند دیتینە کەو و پەز کیڤی
چەندین پلنگ و ئو شێر و ڕویڤی

ژیان لێ تێکدا دەک بوردومانێ
ب ڕەشاندنا ژەهرێ ل کوردستانێ

تە چەند دیتینە مزگەفتێن کوردا
چەندین خویندنگەهـ ل هەمی ئەردا

---

(١) شێخ عوبەیدوڵلاهێ نەهری ل ساڵا (١٨٨٠)ێ سەرهلدان کر و ل داویێ ل ساڵا (١٨٨٣) هاتە دویرکرن بۆ حیجازێ و هەر ل ئەوێ ساڵێ ل وێرێ مالئاڤایی کر.

(٢) سەید ڕزا ل ساڵا (١٩٣٧)ێ ل دێرسمێ ب شۆڕەشەکێ ڕادبیت، لێ ل داویێ د هەمان ساڵدا دهێتە سێدارەدان.

چــــول و وێــــران بــــوون ب دەســــتێ نامــــەردا
ســــەر مــــە هــــەلینــــە ظولْمــــا ڤــــا خــــودا

تــــە چــــەنــــد دیتینــــە عــــالم و زانــــا
چــــراییێن دیــــن و دنیــــا یــــا وانــــا

کــــەفتینــــە بــــەر ڤــــا بــــا و بارۆڤــــا
ژینــــا وا ل دنــــێ بــــۆ دەرد و جــــەفــــا

تـە چـەنـد دیتینـە مللـەتێـت هـەژار گـەهشـتن خێـڕا
بوونە حاکم و وەکی گەلەکا حوکمێ خۆ گێڕا

ژبلی مە کوردا کو هەر مەحکوومین سولْتان مە نینە
ئـەیـی ڕۆژێ لـەوا (صـەدر)ی دلـێ وی تـژی برینـە

ل ســەر ڤــێ هــەمــێ زێــدە دخــۆم خــەمــێ
دویــرم ل وەڵاتــی ترســم نــە گــەمــێ

ترسـم بمـرم ل خاکـا (کۆیـت)ێ ل نـاڤ غـەریبـا
وەڵات و خزمـا هـەمیـا بهـێلم ئاهـ بـۆ طـەبیبـا

بەلێ من هیڤی هەیە ب خودێ وەلاتێ ڕزگار نێ ئەز ببینم
کولا هلینم گولا بچینم ئەڤان هۆزانا ئەز لێ ڤەخوینم

ئـەگـەر هـات و ڕۆژ ل مـن ئاڤـا بـوو ل وەڵاتـی هـەڵات
وەرن بێژنـە مـن مـزگین ژ تـەرا ڕزگـار بـۆ وەڵات

ئـەز دێ بێـژم وە پیـرۆز بیت گـەل و ل وە ئـەو خـەلات
هـوین بێـژن خـودا ل(صـەدر)ی ببووره بـدەیـێ نـەجـات

ل کانینا دوویێ ل نوهەت و ئێکێ مە نەزم لێتێ[1]
پاشی هزارێ دگەل نەهـ سەدێ ل سەحرا (کۆیت)ێ

---

[1] ١٩٩١.

بــەلــێ كــول و گــول مــن ڤێكــرا چانــدن
شــوكر بــۆ خــودێ ل مــن گــول وەرانــدن

(مەسعوود)ێ[1] برام نوهەت و ئێكێ نوزدەی مەها هەشت
ڕۆژ لــێ ئاڤــا بــو خــودا جهــێ وی بكــە یــە بهــەشــت

---

[1] مەسعوود برایێ هەلبەستڤان مەلا سەدرودین ل سالا (١٩٥٧ز) ژدایكبوویە و ل سەرهلدانا (١٩٩١ز) هاتە شەهید كرن.

## جگاره یا خرابه[1]

هـــیچ تـــو نـــه کێشـــه بیهنـــا تـــووتنێ
کـــو بـــو تـــه تینیـــت دەردێ مرنـــێ

مـــالێ خـــۆ د هـــاڤێی ددەی ســـۆتنێ
جـــانێ خـــۆ دئێخـــی پـــەنجـــا مرنـــێ

ل دەڤـــێ تـــه تێـــتن بێهنـــا جگـــارێ
ســنگێ تــه ڕەش کــر وێ ژەهــرا مــارێ

نــەخۆشــینێ ددەێ ل خــۆ و گــەلــەکــا
ل هــەمــی حاضــرا هــەتــا مــەلــەکــا

جگـــاره کێشـــان عـــەیـــب و عیللـــەتـــه
ل ڤـــی ســـەردەمـــی هـــەر خـــەجالـــەتـــه[2]

هیمـــەتـــێ بکـــه بهێلـــه جگـــارا
دویرکـــەڤـــه بـــرا ل ڤـــان توخمـــه کـــارا

ل کادیـــا مـــەزیـــەلا دفنـــا خـــۆ دگـــری
بـــۆچی ب پـــارێ خـــۆ دویکێلـــێ دکـــری

---

[1] ئەڤ هەلبەسته ل ڕێککەڤتی (۱۹۹۱/۱/۲۰)ێ، ل وەلاتێ (کۆێتێ) هاتیه ڤەهاندن.

[2] شەرم.

## نینە وەك تە كوردستان[١]

كوردستان خۆ بخەملینە ب جلكێ كوردی
وێ گەردەنا نازك بینە ژ دل و مەردی
دلێ برین بكەوینە بكوژە دەردی
سەبڕ و قڕاڕ لێ نەمان ژڤانێ تە

بۆ وەصلا تە جەرگێ من سۆت
شەڤ و ڕۆژێ من كر و دگۆت
بوارێ خۆ من هەر دگۆت
دەرمانێ من زۆزانێت تە

چم زۆزانا دناڤ مێرگا ئەزێ ڕوینم
بەر سێبەرا دار دیندارا خۆ ڕازینم
جە و هەوا كەلەك خۆشن خەوێ بینم
خەوەكێ بكەم ل باغێ تە

ل وارێ تە خەوا خۆشە
لەزەت زۆرە مە كەیف خۆشە
وارێ كوردا هەردەم خۆشە
بكەیفە بێ نەوایێ تە

ل باغێ تە چەند بگەڕێم ماندی نابم
هەتا هەمە هەر گاڤانێ خەلكی نابم
نە من جهە نە من حالە ژ كێ جودابم
جو دانابم ئەز ناهێلم با وەلێ تە

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (١٩٩١/١/٢٠)ێ، ل وەلاتێ (كۆیتێ) هاتیە ڤەهاندن.

نژدا دێ کەم تالان تو بی
خۆ شیش بۆ من دێ هەر تو بی
کەوێ رۆباد دێ هەر قەبی
چاڤەرێمە کەنگی دێ هێت ئەو دەرفەتە

خۆش دەرفەتە ئەز تە بینم
خەم و کولا بتە برەڤینم
داخا دلێ خۆ بکەوینم
وەکی خەلکی سککە و دراڤ هەبیتن تە

بەدرا[1] تەمام چاردە شەڤی
شەڤا تاری ژبەر تە رەڤی
ستێری رژیای دلێ ئەڤێ
تیشکەك ل نورا ئەڤینا تە

تو گولشەنا باغێ منی
تو رەونەقا[2] مالا منی
چەشم[3] چرا شەڤا منی
ئەزم نوژدار بۆ ئێشا تە

ئەز نوژدارێ ئێشا تەمە
رەزڤانێ باغێ تەمە
کورد پلنگێ چیایێت تەمە
ئەز تیمارێ[1] برینا تە

---

(1) هەیڤ، مەه.

(2) رەوش.

(3) (چشم) ب زمانێ فارسی رامانا (چاڤ) ددەت، مەبەست ل ڤێرێ رۆناهییە.

ل ئێشـــــا تـــــه ئـــــەز دزانــــــم
ل تـــــه خۆشـــــتر ئـــــەز نـــــزانم
ســـەر تـــەختـــێ تـــه ئـــەز ســـوڵتانم
چـــەنـــدا خۆشـــه ژینـــا دگـــەل تـــه

---

(١) برینپێچ.

## کوردستان عەید و سەر ساڵە[1]

جـــەژنـــا مـــە ڤـــێ ڕەمـــەزانـــێ
هـــات نـــاڤ ســـەنگـــەرا ل ئیرانـــێ
ئـــەرێ گـــەلـــۆ خۆشـــی کـــانێ
بـــێ ســـەربـــەســـتی دچینـــە مالـــە

نـــە د ئـــازادین چـــین مالێـــت خـــۆ
خۆشـــکەیـــن کـــەیفا زارۆکـــێن خـــۆ
بچـــین جـــەژنـــا هـــەڤالێـــت خـــۆ
مـــاین غـــەمبـــار نـــە مـــە حالـــە

خـەلـك و عالـەمێ کـەیفا خـۆ کـر
بـــدو قـــولی هـــات و چـــوو کـــر
ســـەرەدان و عـــەیـــد پیـــرۆز کـــر
مـــە ژی ڤێـــرێ عـــەیـــد لـــێ تالـــە

مـــە عـــەیـــد تالـــە ل ڤـــی دەمـــی
کـــو ســـەربـــازین نـــێ ئـــەم هـــەمـــی
هـــەمـــی گاڤـــا دبیـــین قـــەمـــی
ئـــازاد دببـــین چینـــە مالـــە

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩١/١/٢٠)ێ، ل دەڤەرا (نەفتخانە ـ ئیران) هاتیە ڤەهاندن.

ئـــەم نیزیكـــی ســـێ ســـەد هـــزار
هــــەمـــی كــــوردین ب یـــەك بریـــار
خـــەمـــا مـــالێ مـــە بــــۆ ســـەریـــار
بچیــــــك و جاحیـــــل و كالـــــــه

مـــە ڤـــە نـــەڤێـــت مـــە دڤێـــت یـــادی
ســـەربـــەســـت بـــژین وەك گـــەلـــێن دی
مــــــە ژ كـــــوردا را دڤێـــــت ئـــــازادی
كوردوســـــتان عـــــەیـــد و ســــەر ســـاڵە

خــــــارن نینـــــــه تێـــــرێ بخـــــۆین
مـــــە ئـــــاڤ نینـــــه خـــــۆ پـــێ بشـــۆین
چ جـــــه نینـــــه كێڤـــــه بــــــڕۆین[1]
مــــــە هـــــزرەت ئاڤـــــا شـــــرین زەلاڵـــــه

ئاڤـــــــا شـــــــرین مـــــــە هـــــــزرەتـــــــه
خــــۆ پـــــێ بشــــوین نــــــەدامــــــەتــــــه[2]
ئاڤـــــا ســـــویریش بـــــێ لــــــەذذتـــــه[3]
تامـــــــــا زاری هـــــــــەرا تاڵـــــــــه

هیڤیـــــــــدارین ل تـــــــــه یـــــــــەزدان
مـــە ڕزگـــار كـــەی ل گشـــت نـــەخۆشـــیان
مـــە تـــەســـریح كـــە خـــودان ئێحســـان
د دونیا و د ئاخرەتێ خۆشكه یی ماله

---

[1] بچین.

[2] پەشیمانی.

[3] خوەشییه.

## تویی داخازا هەمی کوردا[1]

تــــویی داخــــازا هــــەمــــی کــــوردا
دەرمــــــانێ گشــــــت ئــــێش و دەردا
هــــەمــــی ســــالێ هــــەمــــی ئــــەردا
ژ کــــەیفــــادا دکــــەیــــن شــــاهی

تــــو ســــەرەوەری تــــو ســــەمیــــانی
تــــو دلخــــازا مــــە کــــوردانی
تــــو دەرمــــانێ دل کــــولانی
تــــە بــــەرنــــادەیــــن هــــۆ ب ســــاناهی

وەك بهــــەشــــتێی کوردســــتانێ
کــــێمن وەك تــــە ل جیهــــانێ
بــــەلــــێ چبکــــەم بــــێ خــــودانێ
ئاســــمانێ تــــە نــــە بــــو ســــاهی

کورێــــت تــــە بــــوون ب دوو قــــولی
ب ســــەرێ خــــۆکر ئــــەوان خــــولی
ژبــــەر ڤینــــا پــــارە و پــــولی
نــــەمــــا ل خــــاکێ وان ئاگــــاهی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١١/٥/١٩٩٦)ێ ل گوندێ (بامشمش – دەڤەرا زێباریان) هاتیە ڤەهاندن.

ل خاكا زێڕین بێ ئاگەهمان
دوژمن دكێلیت مولكێ هەمان
باور بكەن هوین چ نەمان
لەو ڤەمانە ل دویماهی

چەوا دبێژی كەرێ گرتی
مە نینن كێماسی و كورتی
مە مافێ خۆ یێ وەر گرتی
نێ ئەم ناكەین چ دەعواهی

كا ژینا تە كا نەفتا تە
كا ئەردێ تە كا ئاڤا تە
كا مرۆڤ و كا پەزێتە
تە ژبیركرن هۆ ب ساناهی

مە دڤێت وەكی خەلكی بژین
زمانێ زك ماكی بخوینین
وەلاتێ خۆ ئەم ژێ هەژین
ئالا هلدەین ببیت ساهی

نە هۆشیارین خۆ هۆشیار كەن
ل خەوا نە هش سەری ڕا كەن
ب هەر دوو چاڤا تەماشە كەن
كەركووك دنالی ب ئاهە واهی

خودا دایێ مە خێرەك مەزن
بۆ مە دەشت چیاییێت بەرزن
ڕویبارێت بۆش ئاڤێت تەزن
مە جە كانییێت زێڕێ سیاهی

مه جه کویستان و گەرمیانن

هاڤین هەوار و زۆزانن

جهێت شێرا و پڵنگانن

ڕویڤی دەرچوون بدویماهی

بەلێ ئێوەش وەکی ئەوا

نەهش نەبن کەڤن خەوا

نەبێن ئەڤرۆ بۆ مه هەوا

قەصر سازی و دولار بازی و سەرێ گایه

نه خۆ دێ بێن ڤه دلسۆزن

نەخێر و نیه مللەت کۆژن

ل کێڤه ئینان ئەف مال و دن

نێ مه دیت بوون گەلەك ڕویت بوون نه هوسایه

دلێ خەلکی هوین ڕەش نەکەن

شولێ خۆ ژی بن پویچ نەکەن

ڕەوشا کوردا لێ تێك نەدەن

زۆر ساخ دلا دل ئەڤرۆکه ل هنگو مایه

کا خێزانێت شەهیدێت وه

زەحمەتکێشێت بۆ گۆتی وه

کا پەککەفتی و هەژارێت وه

وه سویند ئەڤرو ب سەرێ غێر کەس و دەزگایه

نێ ڤه بەرێ ڕەنجا مه هەمیانه

خلمەتا چەند ساڵ یا دل پاکانه

ڕەحما خودا و پاشی خوینا شەهیدانه

پوچ رێبەرین دلێ ڤانا وه هێلایه

مـه ڤـەهانـدی بـۆ نـەصـحەت شـیرەتــێ
نـــەك بـــۆ طـــەعنـــەدان و نـــەفـــرەتـــێ
نـە بـێن (صـەدرودیـن)ی لـەو مـە ل مـەتــێ
داهــوین بێــژن مــە ژڤــان کــارا توبــەیــە

تـــەوبـــەیـــێ بکـــەن ل خـــراب کـــارا
دینـــــــــــــی نـــــــــــە دەن ب دولارا
دەرکـــــا ڤـــــەکـــــەن ل هـــــەژارا
ل دیـن و دونیـا خۆشـی ژیـان هـەر بـۆ وەیـە

## داخاز[١]

مـن داخـاز بـوو ژ مێـژه حـوكمێ كـوردا ببيـنم
ظـوڵم و سـتەم سـەرێـژه خـەم و كـولا هـەليـنم

ب پـەخشـان و هۆزانـا مـن تيـر بـەردان نـەيـاران
كـورد خـەباتێ پێبكـەن بشـكێ دۆشـكێ زۆرداران

سـوپاس يـەزدانـێ عالـەم داخـازا مـن هاتـە جـێ
شێر و پلـنگ ڤـەرەستن ئـاوارێن مە گـەشتنە جێ

هـات قێرينـا پلنگـا سـەرێ چيـان سـەركـەفـتن
نـرە نـرا شـێرانە ل نـاڤ بيشـان دەركـەفـتن

پێشـمەرگـە جـان فيدانـە ئـازادى بـۆ مـە ئينـا
سـەرێ دوژمنـا چـەمانـد سـەرێ كـوردا هـەلينـا

ل نـەهـ سـەد و نۆت و ئێكێ پاش هـزارا زاييـنى[٢]
گـەلێ مـە گـرتن چـەپـەر د (بـەرەيـەكێ) ئاسـنى

سـەرهلدانـەك دروسـت كـر (رانيـە)[٣] بـۆ دەروازە
رێكخراوێـت نـاڤخۆيى ئـازادى مـان داخـازە

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل رێككەڤتى (٢٠٠١/١٠/٧)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زێباريان) هاتيە ڤەهاندن.

[٢] ١٩٩١ز.

[٣] ئێكەم دەڤەرا سەرهلدانا سالا (١٩٩١ز)ێ لێ دەستپێكرى باژێرێ رانييە بوو لەورا ب (دەروازەيا راپەرينى) دهێتە نياسين.

ئـــازادكرن گونـــد و شـــار پـــاقژكرن ژ دوژمنـــا
پێشـمەرگـە و جـەمـاوەری سـیخۆڕ دەرئینـان كونـا

بێنـا خـۆ مـە هـەلكێشـا ئوخـەش مـەدیـت ئـازادی
مزگینــی بــۆ شــەهیــدا بــەرهــەمێ وان هاتــە دی

سـایەی[1] ڕەحمـا یـەزدانـی پـاش ب خـەباتـا دلسـۆژا
كوردســـتانا ئـــازادە مـــە دەســـت هاڤێـــت پـــڕۆژا

قومانــدارێت مللــەتــی حوكمــەت و پــەڕلــەمــانن
ڕێبــەر و ســەركێش هەنە خــۆیی و بیــانی دزانــن

گونـد و شـارا ئاڤـا كـەن بـەختـەوەریـن ئـەڤـرۆ ئـەم
پایتـەختێ مـە (هـەولێـر)ە خۆشـە وەك بـاغێ ئیـرەم

---

[1] سیبەر، باشی و قەنجی.

## ناڤێتە هەر مایە قەلات[1]

ب هاتنا تە گەش بۆ وەڵات
ژ کوردا ڕا تو بوویی خەلات
ب چوونا تە ژار بوو وەڵات
ناڤێ تە هەر مایە قەلات

تو ناسناما مە کوردا بووی ل جیهانێ
سالارەکێ بێ وێنە بوویی ل کوردستانێ
سەدێ بیستێ نەبوون وەک تە د مەیدانێ
بەرزترین سەر کێش بووی ل گوڕەپانێ

تو خەمخۆرێ گەلێ خۆ بووی
داخازکەرێ مافێ مە بووی
تو زانا بووی تو ڕەهبەر بووی
تو ڕێزان و پێشمەرگە بووی

بنەواسە بۆ کوردا دانا
دوژمن نەچار دەت بە یانا
(مصطەفا)[2] نێ تو بووی دانا
ڕەحمەت ل تە وەک بارانا

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (٢٠٠١/١١/٩)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زێباریان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] مەلا مستەفا بارزانی.

## موحەمەد شاسوارێ بۆڕاقێ[1]

(موحـــەمـــەد) شاســـوارێ[2] بـــۆڕاقێ[3]
ئێمـــامێ (کـــەعبـــە) و ڕەواقـــێ[4]
ســـوارێ گـــەشـــتی عیملاقـــێ[5]
وەکـــی برقـــێ وێ هـــاژا بـــوو

دەوارەك زیبــــــا[6] و برقــــــدار
چوســــــت[7] و چـــالاك و بالـــدار
ســـەرخـــاترا نـــەبیـــێ موختـــار[8]
جبرائیلـــــی بـــۆ ئینـــا بـــوو

دبـــــەیتـــێ دا ئیســـــرا پێکـــــر
ڕێکـا مانگـەك کـێم شـەڤـێ کـر
قـــەصـــدا مزگـــەڤتـــا قودســـێ کـــر
ل ئـــەقصـــایێ ئـــەو پـــەیـــا بـــوو

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٢/٧/٧)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زێباریان) هاتیە ڤەهاندن.

[2] سویارێ ب هەیبەت مەبەست موحەممەد پێغەمبەر (س،خ).

[3] ئەو هەسپێ ب چەنگ کو پێغەمبەر (س،خ) د شەڤا میعراج بری ئەسمانا.

[4] ئەیوان، بان.

[5] مەزن.

[6] جوان و دەلال.

[7] زیرەك و زەڤەر.

[8] هلبژارتی.

شـــير و و شـــەڕاب ژێـــرا ئينـــا
((فطـــرة اللـــه))[١] ئـــەوى بينـــا
دەســـت ڕاكـــر و ســـەرهـــەئينـــا
شـــير پيـــرۆزى وان لێڤـــا بـــوو

نـــوڕ[٢] جـــەمـا بـــوون د مزگـــەفتێـــدا
خێـــرا خـــوداى هـــەمـــوو تێـــدا
موحـــەمـــەد ســالار[٣] بـــوو د قودســـێدا
خـــوداى پـــەيمـــان ل وان ســـتاند بـــوو

پێشـــنڤێژى بـــۆ هـــەميـــا كـــر
ئيمـــامێ پێشـــينا و ئـــاخر
عـەلـەمـێ عالـەم ( ئـەحمـەد)ێ فـاخر[٤]
كـــو ســـەردارێ وان هـــەميـــا بـــوو

پاشـــى ميعـــراج[٥] بـــو وى دانـــا
داخازكريـــە بـــۆ ئـــەســـمانا
بـــۆ دل خۆشـــى و نيشـــادانا
قـــەدەم[٦] ل صـــەخـــرەت[٧] واللـــه بـــوو

---

(١) ئەو پێزانينێن خودێ دەته مرۆڤان لدەمێ ئافراندنا ئەوى.

(٢) ڕۆناهى.

(٣) سەروەر، سەردار.

(٤) ب بها.

(٥) چوونا موحەممەد پێغەمبەرى (س، خ) بۆ ئەسمانى.

(٦) پێنگاڤ.

(٧) صخر ب زمانێ عەرەبى ڕامانا بەر و كەڤر و تەحت ددەت.

بـــۆ ئاســـمانا نـــورِ داخـــاز كـــر
ل زۆر تشـــتا ئاگـــەهـــدار كـــر
مـــوعجيزە بـــوو ئـــەڤ وەغـــەر كـــر
لـــەوا نـــورِين بلنـــد رِابـــوو

تـــەبـــەق تـــەبـــەق لـــێ ســـەركـــەفتـــی
نـــە حـــاكم چـــوون نـــە چ مـــوفتی
نـــە ديتبـــوو كـــەس د پـــێش وەختـــی
بـــۆ ((ســـدرة المنتهـــی))[1] بـــوو

فريشـــــتا[2] و پێغـــــەمبـــــەران
وان بـــێ گونـــەهـــ و ئـــەنـــوەران
جـــــەم ســـــەردار و ســـــەروەران
بـــۆ رێزگـــرتن تـــەمـــەننـــا بـــوو

ب خێـــر هـــاتی تـــوێ مێهڤـــان
(موحـــەمـــەد)ە بـــابێ رِووحـــان
دوعـــا گوبـــوون پێغـــەمبـــەران
پاشـــی بـــووری ل وان ئاڤـــا بـــوو

ل عـــەســـمانا تـــو (ئـــەحمـــەد)ی[3]
ل ســـەر عـــەردا (موحـــەمـــەد)ی[4]
تـــەيـــا هـــەی خێـــرا ســـەرمـــەدی[5]
ديـــدەڤـــان ســـورِەتـــا (ن) بـــوو

---

[1] دارەكا گەلەك مەزنە ل بەحشتێ. د قورئانا پيرۆز، سۆرەتێ (النجم)، ئايەتا (١٤) دا هاتيە.

[2] مەلائيكەت.

[3] قورئانا پيرۆز، سۆرەتێ (صەف) ئايەتا (٦).

[4] قورئانا پيرۆز، سۆرەتێ (ئالی عيمران)، ئايەتا (١٤٤).

[5] ناڤەكێ بەحشتێ يە، هەتاهاتايی - بەردەوام.

ئـەو سـەركـەفتـی بـۆ سـیدرەتـێ
وی بیركـــر دەورێ میحنـــەتـــێ
داخـــازكر دیتنـــا جـــەننـــەتـــێ
جـەننـەت و (العـدن)ێ نـەظـەر دابـوو

ئـەمـین دگـەل بـوو گـەلـی بـرا
فریشـــتێ (وەحـــی) و بـــەرپـــەرا
پـــەیـــامنێرێ پێغـــەمبـــەرا
تـــا گـــول دەنگـــێ پێنوســـا بـــوو

چـــوو بـــوو نیزیـــك خـــودایێ خـــۆ
وی (نـــور)[١] دیتـــی بچـــاڤێ خـــۆ
نێزیـــك ب روح و جـــەســـەدێ[٢] خـــۆ
ب (میقـــدار)[٣] دوو كڤانـــا بـــوو

بـــو چـــوون ل ڤێـــرێ مـــەرد و زۆرن
یێـــت پێشـــینیا و جمهـــۆرن[٤]
ئـــەوان گـــۆت ژی جـــوراو جـــۆرن
دەڤ زانایـــان ســـێ مانـــا بـــوو

دا نیشـــا ب دەتـــن نیشـــانا
خـــودانێ وەحـــی و قورئانـــا
ســـوارێ بۆرجێـــت ئاســـمانا
كـــو مێهڤانـــەك زۆر ئـــازا بـــوو

---

(١) ڕۆناهی.

(٢) لەش.

(٣) ئەندازە.

(٤) تەماشاچی.

ئـــــەو خـــــەلاتكــــــر ب نڤێـــــژا
بشـــكێ دفنـــا گـــومڕا[1] و گێـــژا
خـــــودان بهـــــا و ڕێـــــزە هێـــــژا
دیـــــاری ســــــــەروەری نـــــــابوو

گـــول (موحـــەمـــەد) گـــەڕیانـــەك كـــر
ل عـــەرش و فـــەلـــەك وی نـــەظـــەركـــر[2]
ل دەور و چانێـــت خـــو وی ســـەحكـــر
ل بهــــــەشـــــتێ هــــــاڤڕێ دابــــــوو

دیـــتن ل وێـــرێ كـــەســـێن فـــەقیـــر
بـــــەلـــــەنگازێـــــت دنـــــێ ئێخســـــیر
خـــــودان طاعـــــەت خـــــودا ژ بیـــــر
ئیمـــــان دارێـــــن دونیانـــــا بـــــوو

ل دوزەخـــــــــێ هــــــــاڤڕی داڤـــــــە
چالـــــەك كـــــویرە ئـــــاگر دناڤـــــە
كـــــەســـــێن تێـــــدا داخـــــاز ئاڤـــــە
شـــینی و گـــریـــا جـــەنـــەم یـــا بـــوو

دیتـــــی زۆربـــــەی هـــــەوار كرنـــــا
ڤـــــەپـــــاڕین و پـــــەناهبرنـــــا
پـــــەشـــــێمانی و چ بخـــــۆ كرنـــــا
خـــــودان ســـــامان و ژنـــــا بـــــوو

[1] سەرداچوویان.

[2] سەحكەری، لێ نێڕا.

دەما زڤڕیڤە ئەقصایێ
د تەشریفێ خەبەر نایێ
بوێ دیاریا (خودێ) دایێ
ئەو خەلات ژی ب کەس نەدابوو

ژ قیبلا ئێکێ ئەو دەرکەفتی
ب کەس نە دابو ئەو دەسکەفتی
هەر وێ شەڤێ و کات و وەختی
بۆ زڤڕینێ ڕکێب دابوو

برێژە خودێ درود و سەلام
سەر عەظیمێ فاق العظام[1]
بەرێخۆ دا (بەیتولحەرام)
شەڤ هنگوری[2] (سەجا)[3] مابوو

ب ڕێکێ ڤە دیت بوون کاروان
بزربوو وشترەك[4] وان
د شامێ دا کو ڤەدگەڕیان
بازرگانیا قورەیشا بوو

دەما گەشتی د مەککێ دا
ب ڕۆژ چوو حەوشا بەیتێ دا
موشریکان چوون دەورە لێدا
موئتەمەرەك[1] گرێدا بوو

---

(١) سەر کەسانێن مەزن.

(٢) شەڤ پێڤە چوو بوو.

(٣) نخاڤتن، سەرداان، تاریاتیا پەیت، ئایەتا (٢)، سورەتێ (الفجر)

(٤) حێشتر.

ل دەور و چانــان جــەمــان قـــورەيـــش
ئـــەو كافرێـــت خـــولى بعـــەيـــش
بـێ حيمايـە[٢] و عـەسـكەر و جـەيش[٣]
بـــو وان شـــەڤرۆڤـــە گێـــڕا بـــوو

كـــەتـــن گالتـــە[٤] و پێكـــەنينـــا
ئـــەڤ ڕێكـــا دويـــر چـــەوا بينـــا
مـــوعجيزە بـــۆ خـــودايى ئينـــا
ئـــەبۆبـــەكـــرى تـــەصـــديق دابـــوو

ئـــەو لـــێ پرســـين ئـــەگـــەر ڕاســـتى
تـــو مێهڤـــان بـــوى خـــودا خاســـتى
ئـــو گـــەهشـــتى ئـــەوى ئاســـتى
بێـــژە ئـــەقصـــا يـــا چـــەوا بـــوو

وەصـــفا مزگـــەفتـــى (نـــەبـــى) كـــر
ل پـــێش چاڤـــا وێنـــە چێكـــر
صـــاحەبـــۆ مـــا مـــوعجيزێ بـــر
ســـەر ســـوڕمانا موشـــريكان بـــوو

ئيســـــرا ثابـــــت[٥] ب قورئـــــانێ
مـــونكر بـــەريـــە ل ئيمـــانێ
(موحـــەمـــەد) كانيـــا عيرفـــانێ
بـــۆ ميعراجـــێ حـــەديـــث مـــابوو

---

[١] كونفرانسەك.

[٢] بێ زێرەڤان.

[٣] لەشكەر.

[٤] ترانە، حەنەك، يارى.

[٥] سەلماند.

فاروقی[1] کر فەتحا قودسێ
کافر کەتن لەرز و ترسێ
فتوح کرن بابێ (حەفصێ)[2]
دادپەروەرێ مۆمینان بوو

(صەلاحەدینی)یش[3] ئازاد کر
خاج پەرستا ل پێش وی ڕاکر
قیبلا ئێکێ وی ڕزگار کر
ڤەژی فەخرا مە کوردا بوو

ژ دوو لایان مە شانازی
ب ئیسلامێ ئەم بووین ڕازی
مە زۆر هەنە (صەقەر) بازی
ب عومەر و صەلاحا بوو

کا ئێکێ وەك صەلاحەدینی
حەڕەما سییێ ل جوییا بستینی
قودس ئەڤرە دنالینی
ل ژێر دەستێ جویها بابوو

بۆ چ کێمیاوی ل کورد ادا
ئەنفال[4] دانا سەر ئەکرادا
(قودس) دژیت چ حالا دا
دا جویە بێژن سزایێ وابوو

---

(١) مەبەست عۆمەرێ کوڕێ خەتابی.

(٢) حەفصا کچا عومرێ کۆڕێ خەتابی، هەڤژینا پێغەمبەری (س، خ).

(٣) سەلاحەدین یووسف نەجمەدین ئەیووب دامەزرێنەرێ سولالا ئەیووبیان (١١٦٨-١٢٥٠م)ێ سەلاحەدین ب قەهرەمانێ شەرێن خاچپەرستان هاتیە نیاسین.

(٤) ئەنفالا (١٩٨٨).

نــــەگـــــرن ڕێـكـــــا خــــــراب پیســــــا
ظـــــــــالم زۆردار و ئیبلیســـــــــــــا
گاڤـــــا (صـــــــەدر)ی ڤـــــە نقیســـــا
دوو هــــــــزار و دوویـــــــــا دابــــــــوو[1]

دوبــــــــاره بێـــــــژم درود و ســـــــلاڤ
خـەمـلا قـەفـدەکـا گـولێـت پـر خـونـاڤ
ل بەر (موحـەمـەد) مـن جـان گـوری نـاڤ
(نـــورِ) و (هیـدایـــەت)[2] ڕۆنیـــا مـــە بــوو

(1) سالا ٢٠٠٢.

(2) ڕێکا ڕاست.

## نەڤێت جهـ و وارێ خۆ[١]

برانۆ من حەیف و خەم بۆ جارا
بوسولمان ل خۆ ناکەن چارا
چاڤێ وان هەرێ ل دولارا

نەڤێت جهـ و وارێ خۆ
نەفرەت دان ل توڤێ خۆ
کێڤە بچین ئەم بخۆ

دێ چین دەولەتێن بیانی
دا ل مە بکەن خودانی
ل بیر چوو سفرا یەزدانی

سفرا خودایی بەرینە
چ هەوجەیی دەرڤە نینە
قایل بوون بۆ تە ژینە

دێ چی ئەورووپا چکەی
دێ تو زارۆکا ژ دەست دەی
یان ئاایینی بزر کەی

تو خودێ ما ئەو ژینە
پیشینان هۆ نە بینە
ما ئەڤ کارە شەرم نینە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل سالا (٢٠٠٢/١٢/٢٢)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زێباریان) هاتیە ڤەهاندن.

نێ ما تو موسولمان نینی
ل بییانیا دکەی غولامینی
شەرمێ بکە ژ دینی

گەر قوتابی یا بالیۆزێ دەولەتێ
بۆ دوزا گەلی خۆ یان تجارەتێ
تو نە ساخی یان تو دێ کەی دەعوەتێ

ل وی چاخی ڕێ بۆ تە هەرا دایە
خودان بەهری چ چاکی تە وێرایە
ژین وێرێ بۆ دینی نە ڕەوایە

ل ناڤ وەلاتێ خۆ بمینە
بۆ گەلێ خۆ خۆ ب وەستینە
خودێ ڕازقە کەس دی نینە

کافران دلێ وان هەر و هەرێ دەغەلە
دڤێت بوسلمان بکەن جوی یان ژی فەلە
زۆرا ب سەر هاتینە ئەڤ مەسەلە

بوسولمان چاڤ دوربینا گەلێ خۆبە
ئیرو تو زۆر هشیارێ حالێ خۆبە
زۆرن ڕویڤی تو بلنگێ چیاییێت خۆبە

سەحن و ڤیدیو و دجیتال
ڤەژاتینە بۆ وان مال
لێ هەما هەر ئەڤەیە حال

ژن و زارۆ ل پێش وەستان موقابل بوون
ب دیداران سەرکردان و غافل بوون
دەرس و دەور و عبادەت وان لێ بەزر بوون

شـــــەرم و حــــــەيــــــا داب ڕۆيســــــيا
دكـــەن تـــەقليـــــدا فـــەلـــە و جويـــا
نـــــێ ئـــــەڤ ڕەنگـــــە وان دڤيــــــا

نـێ بيبانيـا كـارێ وان هـەر ئـەڤـە بيـت
ئـــەرزان ســــويكا ســـەحنـــا ڤـــەبيــــت
بوســـــولمان ڕەواج[1] بـــەس بـــۆ تـــە بيـــت

بـــوى بوســــولمانەك بـــەس نفـــوس نـــاڤ
د زەحفـــن بـــۆ گرتناتـــە تـــە بشـــير و داڤ
كـــوفرێ ل ئيســـلامێ هـــەر خـــارە چـــاڤ

گــــەلــــەك كــــرن ئـــــەلمـــــودەخـــــان
ژن ل تــــــە هـــــــەرا ســـــــل و دلگــــــران
بـــــــرايين نــــــــەفــــــەر هــــــۆدە ژيـــــان

تـــــو دچـــــى چــــەيخانــــا و مـــــەيخانــــا
تــــادرەنــــــگ تــــــو هـــــــەرێ ل كولانــــــا
پاكــــــا بــــــــۆ نڤێــــــــژ و قورئانــــــــا

مــــــەى ڤــــــەخـــــۆر و قۆمـــــار كــــــەرى
تــــــە هـــــــەر خاليــــــە جــــــزدان و بـــــــەرى
تــــــو هـــــــەر دخـــــوڕى وەك عــــــەنتــــــەرى

زارۆك ل مــــــالن ڕويـــــــس و برســـــــى
تـــــو ل كـــــار و ژينـــــا وان نـــــا پرســـــى
د پاشـــەڕۆژێ هـــەر تـــو ل وان بـــەر پرســـى

---

[1] بەربەلاڤ، بازار گەرمی.

ل وێـــرێ ســـێ مـــەوقفـــێن[1] دوژوارهـــەنـــە
هـــەر بـــۆ پـــرس و ســـوئالا كـــارێ تـــەنـــە
صەحیفە و پر و كێشانا هەمی كارێن تەنە

ل ڤـان سـێ جهـا ڕەڤیـت ژن بـەر مێـرێ خـۆ
كـــوڕ بـــەر بـــابێ كـــچ بـــەر دایكـــا خـــۆ
دێ مینـــی ب تنـــێ د گـــەل عـــەمـــەلـــێ خـــۆ

فـەسـاد و درو و نـەمـامی ل فامـدارا نـە باشـن
خیانـەت بـێ وەعـد و غـەیبـەت بـێ معاشـن
كوشتن و دزی وجەردەداری نـە بـاش هـەلاشـن

تێكهەلا خرابا نە دونیا دارییە و نـە دینداری
دویركەڤە ل ڤان توڤا ئاقلی نە دین و هاری
هندەك شیرەت بژارن بۆ تە (صەدرودین)ێ زێباری

---

[1] هەلویست.

## صبحەكێ[1]

صـــبحەكـــێ مـــن ديـــت خـــو يـــا بـــوو
پـــڕ شـــرين مســـلێ گـــولا بـــوو
يـــا إلهـــى دێ چـــەوا بيـــت
((دى عورفيـــا شـــێخى ڕابيـــت))
مـــن دزانـــى حـــال فـــەنايـــە

مـــن دزانـــى حـــال ئـــەليمـــە[2]
شـــاكرم ب ڕەحمـــا عـــەليمـــە
مـــن ڤـــەكـــر فـــالا كـــەريمـــە
((كولـــەدارى وى شـــێخى مـــە))
ئايـــەتـــا مـــەوتـــێ[3] خۆيايـــە

ئايـــەتـــا مـــەوتـــێ غـــەدارە
شـــێخ ل بـــەحـــرێ بـــۆ ســـووارە
چوونـــە پـــێش وى گـــەر دوو يـــارە
((كـــەتيـــە دەســـتى گورگێـــت هـــارە))
ڕاضـــيە ب ئـــەمـــرێ خودايـــە

ڕاضـــيە ب ئـــەمـــرێ لـــەطيفـــە[4]
مـــالكى شـــەرعـــێ شـــەريفـــە

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (٢٠٠٢/١٢/٢٥)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زێباريان) هاتيە ڤەهاندن.

[2] ب ئێش و ژانە.

[3] مرنێ.

[4] نازك.

وێ ل ســـــەر قـــــەصـــــرا منيفــــــە[١]
((زانايــــــــەك زۆرێ ظـــــــەريفـــــــە))
گرتيـــــــێ ســـــــێ ســــــاڵەيــــــە

كرتيــــــــێ ســــــــاڵا دەهــــــاهی
كـــەفتيـــە بـــەر فـــەضــلا[٢] ئيلاهـــی
ڕەحمــــــــــەت واللــــــــە عليـــــــە[٣]
((وەل گـــــــــــــوڕێ والديــــــــــــە))
لــــــــەعنـــــــەت واللــــــــە ل وايــــــە

لــەعنــەت اللــە ل ئــەهلــی شــيركا
خـــاج حـــــەبينـــــێ ڕوم و توركــــا
ظــــــاڵم و ڕوم و فـــــــڕەنكـــــــا[٤]
((دوژمنێــــــــــت ســـــــيما و ڕەنگـــــا))
قاتلێـــــــــت شـــــێخێ مـــــــەيـــــە

قاتلێـــــــت نــــــەســــــلا ڕەســــــوولی
شـــــێخەكـــــێ هممـــــەت قـــــەبـــوولی
قــەد نــەكــر ل جــەددی قصــووڕی[٥]
((كــورد نــامری خــوم كــره گــوری))
طـــــــــاڵبێ[٦] ڕوتبــــــــــا[٧] خۆيـــــــــە[١]

---

[١] قەسرا بلند.

[٢] باشی.

[٣] دلۆڤانيا خودێ لسەر بيت.

[٤] ئەوروپی.

[٥] كێماسی.

[٦] داخوازكەر.

[٧] پلە و پايە.

## هات ڕەبیعا نۆڕین[2]

هەستن گەلۆ گوهدنە　　پەیام هات خوش و شرین
هاتی ڕەبیعا نۆڕین[3]　　هات بهارا دین و ژین
تێدا هاتە سەر دنێ　　(موحەمەد)ێ ناڤ شرین
پەیامبەر خودێ فرێکر　　((رحمة للعالمین))

بخیر و بێرا خەلاتکر　　ب ڕەوشتێن بەرز و بلند
سەر بەرزی دین و دونیا　　پلە و پایە زۆر بلند
چەند وەصفا ئەم ژێ بکەین　　هێشمانە هێشتانە هند
پێدان ڕەوشتێن جوان　　خەلک هەمی پێ ڤەژین

خەلق و خولق دجان بوون　　وەفادار و ئەمین بوو
نک دوست و دوژمنانی　　ڕاستێ باوەر پێ کەر بوو
خودان حەیا ء شەرمین　　دەست پاکێ ڕەوشت پاک بوو
خودای چاڤ دێری لێکر　　د پشتێن چاک و بژین

---

(1) هەلبەستڤان دبێژیت: "ئەڤ هۆزانە گەهشتە دەستێ من ژ لایێ سەیدایێ بەرێز (مەلا عیسا مشەختی شەهی) ل سالا ١٩٥٢ زایینی، ئەوی ل بەر کربوو کهو هاتیە ڤەهاندن ب سێدارەدانا سەیدایێ دینی و خەم خۆرێ دۆزا گەلێ خۆ (..........) یا خۆدا ل مە و وی خوشببی. منیش ئەڤ هۆزانە کرە پێنج مالکی و ئەوا د مابەینا دوو کڤانادا لێ زێدە کرنا منە".

(2) ئەڤ هەلبەستە ل سالا (٢٠١٨/٣/١٢)ێ،ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زێباریان) هاتیە ڤەهاندن.

(3) هەیڤا ڕەبیعا ئێکێ.

نورِ بۆ دته وێلا بابێ    پێشی ئەو بێت ڤێ دنێ
نەمان شەیتان ل ئاسمانا    دەما هات نورِا ب تنێ
نەیزەك تیشك بۆچوون    رەڤ و رِو وان كەفتنێ
وان ل ئاسمانا جهـ هەبوون    لێ بەلێ ئەو لێ رەڤین

هێشی كورپەبوو بابێ وی مر    سالا شەشێ دای ژی مر
بخێوكر[1] باپیرێ وی    سالا هەشتێ ئەویش[2] مر
ئەبو طالبێ مامێ وی    پشتگیریا سەروەری كر
ب هەمی هێز و شیانیت خۆ    پاراستی (نەبی) ئەمین

د دەسپێكا ژیانێ زێدەیە د حیرائێ درێژ    پەرستن كر شەڤ و رِۆژانی درێژ
پاشی بۆ هات وەحیا خودای    ئەرێ (ئەحمەد) دێ بخوینە تو ببێژ
بیست و سێ سالانی دەعوەت بووگێژ    دا رِێ راستكەت گشت نەتەوێن گومرِا و گێژ
هزاران سلاڤ ل سەر تەبن ئەی (موحەمەد)    (رسول الله) پادشاهێ مكە و مەدین

---

(١) خودان كر.

(٢) ئەوی.

## ماجئت للدنيا عبثا[١]

يا من لم يكن شيئا     يذكر ولا إنسانا
لا تكن للخالق عاصيا     كقارون و فرعون وهامانا
فهؤلاء الذين طغوا     فى البلاد ونشروا كفرانا
فعصوا الله و الرسول     فأهلكهم البارى و أنجا موسانا
هو الذى خلقك     فى أحسن تقويم كانا
زودك بالعقل السليم     عكس الوحوش و الحيوانا
وأرسل لك رسولا مبشرا     ومنذرا جنا و إنسانا
يبين لك طريق الحق     بالبرهان حديثا و قرآ نا
وأسكنك فى الدنيا     بعضا من الزمانا
وأعطاك فيها نعيما     لا تعد و لا تحصى إحسانا
ليختبرك هل تكن     لنعمه شكورا أم كفرانا
فإن تشكر الله تزداد     و إن تكفر تكن خسرانا
وهيأ لك فى الا خرة     جنة و مالا رأت عينانا
إن كنت فى الدنيا     عابدا و نجحت الأ متحانا
كذالك هيأ لك نارا     و قودها حجارة و بنيانا
إن عصيت له أمرا     ورسبت في الأمتحانا
فالله أعطاك إختيارا     ولم يكرهك حتى الأيمانا
فأنت حر فاختر الهدى     أو أختر العدوانا

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٨٥/١/١٢)ێ، ل باذێڕێ (ئاکرێ) هاتیە ڤەهاندن.

فـــلا تلـــو مــــن أحـــدا إن ... أتبعـــت أ هـــواء و شـــيطانا

فلـــم نفســـك هـــي التـــى ... أمرتـــك بالســـوء والنســـيانا

و دم علـــى ذكـــر اللــــه ... و دع إعراضـــــا و نســـــيانا

تكــــن مرتـــاح البـــــال ... فـذكر اللـه يجلـب الأطمئنانـا

يأأيتهــــا الــــنفس الأمـــارة ... بالســـوء والشـــر للأنســـانا

أرجعـــي إلـــى ربـــك منيبـــة ... تفـــز بالرضـــوان والجنانـــا

نظمـــه (صـــدرالدين) الزيبـــاري ... راجيـــا عفـــو البـــارى مولانـــا

## لك يومان[1]

لـــك فـــي الـــدنيا يومـــان يـــا بشـــر
يـــوم قـــدر ويـــوم لا يأتيـــك القـــدر
ففـــي أي مـــن اليـــومين تحـــذر
فيـــوم لا لاترتـــاح ولاتصـــبر
ويـــوم يأتيـــك القضـــاء حتمـــا والقـــدر
لا يفيـــدك الفـــرار ولا ينجيـــك الحـــذر

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٨٥/١/٢١)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زێباریان) هاتیە ڤەهاندن.

# إلى كل غيور[1]

وا ويلنا ذهب العز فينا ... وضعنا ضياع الخاسرينا
ظلم وفجور و هتك و سفور ... فلهو وخمر فترك الأربحينا
قتل و أستيلاء وغصب وجلاء ... فترك للوعود وحب الظالمينا
فترك للصلاة و حب للحانات ... فمنع للزكاة و أضحى المال دينا
فدفن للفضائل وتبع للرذائل ... وتقليد الأجانب هو المرجو فينا
فنهق كلحمار وطبع العير[2] عار ... وأصبح التقدم فى نهج الملحدنيا
لو قلت بالسفور تكبر خطا الجمهور ... فمنح مثل العير وسام الرا فدنيا
منذ خلق عاريا فى الشوارع ماشيا ... مابالنا نغرس أخلاق الحمر فينا
فروح للسينما وغدو للملاهى ... بالتلفاز بنا الدار لاغراء البنينا
فشيوخ هائمون وشبان غارقون ... وبيوت الدعارات قبلة الداخلينا
مساجد عجيبات لكنها فارغات ... تشكو الى الديان ضياع المسلمينا
عالمنا منزوى للحق لا يرتوى ... مقولة البيان جهاد المرشدينا
يبرىء القضى خصما والبريء متهم ... لقاء أخذ الرشوة مهمة قاضينا
لو قلت بالصلاح وصحت للفلاح ... فقولك مردود بقبول الما رقنا
قنوات اليهود ضلالات النصارى ... لهدم العقائد خطا المبشرينا
تهتم بالفنون بالفن أغفلونا ... معلم الفنون هو التحرير فينا

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٩٨٩/٢/٢٤)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زێباریان) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) گوهدرێژ.

## كفى ما شاهدتم[١]

يا من باعوا ضمائرهم وخانوا الوطن
كفى ماشاهدتم من المآسي والمحن
ألم تسمعوا صرخة ((حلبجة)) الشهيدة
فانظروا الى جلل الجريمة بالرزن
أما شاهدتم الفلم الرهيب الذي
صور أعظم جرم شهدتموه من مجن
أما عاينتم غيرها من المدن والقرى
التي لا قت حظها من التدمير والدفن
فأصعدوا إلى قمة (( المتين)) وأشهدوا
ترون مالاقاه شعبكم من حريق ودكن
فأرتقوا إلى قمة ((گاره)) وأمثلوا
أمام الخراب والدمار وأهتفوا بالهلاك واللعن
لمرتكبي هذه الويلات في أمة
تنادى بالتحرر والأنفلات من الرسن
وأعرجوا إلى ذروة((بيرس)) وأنظروا
الى القرى المهجورة من الأهالي والسكن
وطيروا إلى قمم ((حلبجة)) الجريحة
لتروا بأم أعينكم تلك المجازر والمحن

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٩٩٢/٢/٤)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زێباریان) هاتیە ڤەهاندن.

ورفرفـوا فـوق ((بابـه گرگـر)) و((أربيـل))البطولات

تـــرون آهـــات وواهـــات وداعـــا دنيـــا المحـــن

وأهبطـــو فـــوق رأس مدينـــة((محمود الحفيـــد))

تقولـــون اللهـــم خـــذ جبـــار هـــذا الـــزمن

ثـم أبـدؤا بجولـة مـن ((زاخو))ف((شـهنگار المعـرب))

لكي تطوفوا حـول منـار جزء مـن حـدود هـذا الـوطن

والـــى سلســـلة((حمرين)) و((خـــانقين)) الغـــاز

ف((حـاج عمـران)) و (( المثلـث)) لا خفيـة بـل علـن

تـــرون التهجيـــر والتعريـــب وغصـــب الحقـــوق

ومـــن(( الأنفـــال )) أجـــل عبـــرة لأولـــي الفطـــن

فهيـــا الـــى طريـــق المجـــد والخـــلاص هيـــا

وأبتهلـــو الـــى قاصـــم الجبـــارين كثيـــر المـــنن

## سلام إلى ملا حاجى[1]

عليـــك ســـلام اللــــه من(الصـــدر)
ســـلاما يبعـــد الحبيـــب مـــن القهـــر
ينقلـــة نســـيم الشـــمال بنـــور البـــدر
إلـــي قلـــب جـــريح بســـهم الغـــدر
هـــو الملا(حـــاجي) رفيـــع القـــدر
ليتـــه يـــرى قبـــل نـــزول القبـــر

جوابـــا عنـــه پاشـــى مـــه داڤـــه
إنفتحـــت وردتنـــا پـــرپين و خـــۆ ناڤـــه
تحـــررت كوردســـتاننا ب ئـــازادى ماڤـــه
نســـجنا برلمانـــا بـــەرســـڤا دوذمنـــا داڤـــه
رأيناه يـاحبيبي مـه د سـاخن هـەر دوو چاڤـه
قـد حققـت أمالنـا نـەفتامـه كـارپيزا ئاڤـه

[1] ئەڤ هەلبەسته ل رێككەڤتى (١٩٩٥/١/٢١)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زێباريان) هاتيه ڤەهاندن.

# لماذا كافحنا[١]

اصنعوا لكم أيها الكرد السلام
في وطن جرد من غمده الحسام
اصنعوا السلام أيها الشعب الجر
لتشرق شمس الأخاء ولينجل الظلام
اليوم يومكم من غفلتكم أفيقوا
عار عليكم إدعاء الوطنية والخصام
اصنعوا المجد تستريحوا جميعا
لقد طال الجفاء وكثر الملام
تدعون الوطنية والأسلام بأقوالكم
وتخالفون القرآن والآيات العظام
تسفكون الدماء البرية من إخوانكم
أليس التخريب وإخراج الموتى من القبور بحرام
فهذه حكومة الأقليم والبرلمان توئمان ولدا
أولستم ضحيتم بالغالي والنفيسي لنيل هذا المقام
فلا تكونوا بضد ما كافحتم وضحيتم
وخذوا الدروس والعبر من الماضي الظلام
وأرسخوا قواعد الأخوة بينكم
وأستزيدوا المزيد بشكر الإله تكون شامة بين الأنام

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٠/٨/٢٠٠٢)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زێباریان) هاتیە ڤەهاندن.

دعــوا الخلافــات الجانبيـــة والفرعيـــة بيـــنكم

سـوا ء الخلافـات المذهبيـة أو السياسـية بالتمـام

قولـــوا للبـــارود تـــأخر بومـــة نحـــس

ذقنـا المـر والعنـاء وشـل النظـام

قولـــوا للبـــارود تـــأخر ياعـــدو الحيـــاة

نريـد العـيش كالشـعوب فـي أمـان وسـلام

## نحن كرد[1]

لاتصــــاحب مــــن يعــــيش بالكســــل

نحــــن كــــرد لــــيس الا فــــي الجبــــل

وصــــفنا علــــم وشــــجاعة وعمــــل

للحــــق نــــدين ولنــــا أقــــوي الأمــــل

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩١/١/٢٠)ێ، ل وەلاتێ (کۆیتێ) هاتیە ڤەهاندن.

## في وفاة عمي ملا پير الكاداني[1]

مـــات عمـــي حـــل غمـــي زاد همـــي لفقـــد مـــن
لـــه العلـــم والتقـــى وفـــي الفقـــه لـــه القـــدم
كـــان"ملا پيـــر" الكـــاداني فقيهـــا علـــم الهـــدى
دليـــل مـــن أراد الهـــدى يهـــدي بـــه المعـــدم
حقـــا لقـــد كنـــت صـــريحا مهيـــا غيـــر خـــائف
ليـــث الـــوغى فـــي المحافـــل يفـــرق منـــك الظلـــم
حقـــا لقـــد كنـــت لكشـــف الحقـــائق ســـيدا
يجلـــو عـــن المعضـــلات بـــك الغـــيم والظلـــم
يـــا فخـــر الكـــرد يـــا موضـــع قناعـــة العـــرب والعجـــم
الصـــادق فـــي الفتـــوى تقنـــع بفتـــواك الامـــم
حينمـــا غربـــت ســـمش الشـــموس غـــم الغيـــوث
مـــن أمجـــاد "عقـــرة" قـــد رحـــل الاســـتاذ العلـــم
في التاسع عشر من جمادي الآخرة كانت وفاته
ســـنة ســـبع والاربعمائـــة بعـــد الألـــف هـــائم
فعليـــك رحمـــة البـــاري كجـــري الـــزاب بالزيبـــاري
وأســـكنك الفـــردوس الاعلـــى انـــه الكـــريم الارحـــم

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠١٨/٣/٢٠)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زێباریان) هاتیە ڤەهاندن.

## طار قلبي لشوق الحبيب[1]

طــــار قلبــــي لشـــوقك يـــاحبيبي رســـول اللـــه
روحي الفدا لضريح انت فيه قرة عيني حبيب الله

طابـــت تربـــة حـــوت طيبـــك يـــا نبـــي اللـــه
طــال الجفــاء منــي للقائــك شــفيعي خليــل اللــه

مـــات قلبـــي بـــذنوب كنـــت أخشـــى لقـــاء اللـــه
فكــل رجــائي قــول ربي:"لاتقنطــوا مــن رحمــة اللــه"

املــى الــورود علــى حوضــك الــذي أعطاكــه اللــه
فــالف صــلاة عليــك وســلام يــاخير خلــق اللــه

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠١٩/٨/٢٠)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زێباریان) هاتیە ڤەهاندن.

## في وفات العالم الفقيه ملا عبدالله[1] الهرتلي[2]

أعز الاعزاء وأهل الاربلي
برحيل العالم عبدالله الهرتلي

كان الفقيد فقيها بوصفه الكامل
يزيل به الغبار عن جبين الجاهل

خرجت من الدنيا مرفوع الرأس شامخا
بعد أن تركت أسفارا لغيم الخوارج عاصفا

تزود من التقوى وخير زاد المرأ التقى
واشتغل بالتدريسي طول عمره فارتقى

تركت برحيلك فراغا نبراس الهدى
ولا يملأ الفراغ الا بغذة كذال المقتدى

أيا وردا من الورود المحمدية
ونجما من نجوم سماء العاصمة الفتية

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠١٩/٨/٢٠)ێ، ل گوندێ (بامشمش- دەڤەرا زێباریان) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) مەلا عەبدوڵڵا کوڕێ عەبدلعەزیزی کوڕێ خدرێ هەرتەلیێ سەر ب دەڤەرا خوشناوەتی، ل ساڵا (١٩٥٥)ێ هاتیە ل سەر دونیایێ، دەرچوویێ زانکۆیا (ئیمام ئەعزەم) ل بەغدایە، پاشان مفا ژ مەزنە زانایێن هەولێرێ وەرگرت و بو خودان ئیجازا مەلاتیێ، خوەدی جەندین بەرهەمە ژ ئەوان: ڕۆژی پرشنگدار - ڕۆنکرنەوەی (فتح القريب المجيب)، ڕۆناکی (رب العالمين) شرح منهاج العالمين، ڕۆنکرنەوەی (العقيدة الطحاوية) و... هتد. ل ڕێککەڤتی (٢٠٢٠/٤/٧) ل هەولێرێ مالئاڤایی کر.

أفلت يانجم الكرد وثروة علمك الغزير لم يغلي
فحيا الله عملك الدؤب يا وارث الانبياء والرسل

هكذا الدنيا تدب دبيب فأين ذو النمل لتأخذ بكلاليبها
كل من جائها ضيفا واقفا على أعتابها

خانت الدنيا كثيرا فأين ذو الثراء والملوك
أبادتهم جميعا فطوبى لمن له الرصيد والصكوك

فهذه الدنيا الغرارة وتلك قبيح أعمالها
فاكتسب فيها كل خير قبل شد الرحال فيها

ذقنا كثيرا يا ابن أخي[١] من حليها وحلوانها
فكن جلدا صبورا عزيزى على كل مرارتها

---

[١] مەبەست موحەمەد کوڕێ مەلا عەبدوڵلای.

## (٢) « كوردينو »

كوردينو نانێ وه پاتێ ب دەستێ خو
ج ویژدانه بکەنه دەڤێ دژێ خو
فەرە گەلو دەستێ خو بەن دەڤێ خو
سفرێ دانن ل سەر مێزێ ل بەرێ خو

كوردينو بوچی دوژمن مشیا مه
وی قەتاندو مبه دارستێن هریا مه
کرە کشتەك بێ گوڕێدا سەرێ مه
لەو خوینا مه رژیا سەر خاکا خو

كوردينو بوچ جیهانێ دەنگ نینه
وەسا داد نێنیا ڤێ مللەتێ ماف نینه
بێ بارکەفتن ج هه فالەك وی نینه
دگەل خەلکێ بونه دزێت مالا خو

گەر تو ببی تو پاشا و ئێزبیی
نەکە حاشا مللەتێ خو ژبیر بی
دێ بێن خونه ناسه هەر زیرەك و تو شێربی
دەما لا ددەیی کو تو باددەیی ل هەژارکەیێ خو

كوردينو بێژم بو وه هەمیا
هلون راستا کەن هەمی خاری وکەمیا
ڤیکرا مبکێلن مەقدا دەشت و زەڤیا
دابەرخورێ زێ هلینن تاجێ دانن سەرێ خو

كوردينو گومان نینه کو هوین هەمی خوش مێرن
بو فەنگا خودنێچیر ڤان و ب سێرن
خەنجەر تیژن ل دیوانا لێ مشێرن
بوچی کوردین بو دراڤا وەبەرزە کرن ناڤێ خو

كوردينو نه دووبەری ئێك رێبازێ بگرن
ئالتونێ رەش گەنجینەیە کانی هەمی ئاگرن
بابە گور گور مەشخەلەیە خەلکێ بخوەیێ دخورن
ب تەماشا نابێ پاشا ببن یا رێت خاکا خو

(٢) « ڕوژاوانو نەمانێ »

هلوون ڕاببن گەلێ کوردا ل کوردستانێ
نێ ئەڤرویە ڕوژا ماڤوویان نەمانێ

هەمی پێکڤە ئامادە بن ل گوڕەپانێ
ئێک گرتنە نیشانێ ماڤ و ژیانێ

مانە شەرمە بو مە کوردا ل کوردستانێ
ببین هەڤال دگەل دوژمنێت مێژیانێ

ڕژێم دبێژیت (ئیبادە) کەن کوردا ل کوردستانێ
نینە بو وان ماڤێت مان و ژیانێ

ئەم دبێژینە بو ڕژێمێ و مێ جیهانێ
مەدڤێت بژین ما مێ مەیە ل عومرانێ

گەلێ کوردا هوین ببینە کەزانە هێلانێ
هەشتێ و هەفتێ ڕوژا چارێ مەها نیسانێ

بەلاڤەکر ئەڤ بڕیارە دێ جەنگێ دگەل ئیرانێ
ل هەمی دەرا ڕابون سەرخو کوڕە شێرێت کوردستانێ

هەمی پەخا دژی دوژمنی چونە مەیدانێ
لێک بژاندن وەکی دگورگێ دچیتە پەزێ کوتانێ

ئەڤ ڕێ بڕا ئەڤاکری ویژدان کانێ
هو نەکریە شوعیێت ڕوسیا ل ئەفغانێ

((٧))

تو نەکریە کەسێ بەشێ هەبی ل ویژدانێ

بەلێ ج بکەین بڕیندارین دەرمان کانێ
بکار ئینا چەکێ حەرام نیڤا هەیڤا ڕەمەزانێ
ب چیکێ وژن تەڤ هاڤێتن بەیابانێ

ئەڤ ڕێ ئەڤ بار نابیت بوتە یاتە دیتر دخەونێدا
ئەز دێ کوردا ئیبادەکەم دێ عەرەبا ئینم جهێ دا

جهێ کوردا کوردستانە ڕوژاهاتین ڤێ دنێ دا
کوردو وەڵەن خوینێ و گوشتێ ل ئێک و دو نابنە جودا

٢٧/ئایار/١٩٨٧ (بامشتی)

(٥) «هزرو بیرا ئەز بیر کرم» ((٩))

هزرو بیرا ئەز بیرکرم
دێوانە و شەیدا کرم
ئەز پێچا دخەماوەرکرم
سەرگەردان و حەیرانم ئەز

گرمانجەکێ سەرگەردانم
گاڤ و دەما د هزرانم
ل پێش خەلکی پەریشانم
لەورانا گرم گوشتێ و بەز

گوشتێ و بەزێت من حەلیان
پشتێ و ملێت من چەمیان
غەریبا دەشتێ و گەلیان
وێران بونە ل مە باغ و رەز

مە باغ و رەز وێران بونە
ئاڤ و دەراڤ نخرو بونە
مەیێ دوژمن هو نە بونە
لەوا بئاهو نالانم ئەز

گەلی کوردا راپن سەرخو
دەستێ و پیسیان ببەن بەرخو
کراسێ مشەرمێ بکەنە بەرخو
باغێت وەکا کانێ وە یەز

کانێ گوندێت ئاڤا و بوش
کانێ بچێت کویستان و خوش
کانێ زەرێنی دبەر دەپوش
دحەیفا جاحێلانم ئەز

گرتی ئاگرێ تیرا قەزا
سوتی وەکی باغ و رەزا
ژبەر زولما وان نەحەزا
هەمی دەمێ تالانم ئەز

هەمی دەمێ ئەز تالانم
بەزیارێ دەڤێ وانم
ئەز نێچیرا فەنگاوانم
چ بکەم برا نزانم ئەز

چەکێ حەرام بکارتینیت
ژەهرا کوژەک ل مە دبارینیت
داقرانا کوردا بینیت
پێنج هزار (حەلەبچە)ی بونە غەرەز

(قەرەداغ) و چەند جهێت دی
ل بادینان هەرێما ئێک ئەڤەهەدی
کەس نابێژی خوینێ مێژ بەسەحێدێ
رێکخراوا مافێ مروڤ بریندارێ کیمیاوی ئەز

گەلی کوردا نابن سولتان
ئاغا نابیت جهێ کوردان
هەتا هەنە دوژمنێ ل وان
سوپاس خودێ نە ل وانم ئەز

هەرێ کوردێ بەسە دیسا
نەکەن گوهدار هزرا پیسا
چ بەلایە بو وە قەومیا
عەجێب گرتیێ هەمانم ئەز

هلو گەلێ مە هەستە
سەرێ زوردارا ب پەستە

هەستە هێشی نەبی درەنگە
(نەبگرتنا) دارێ تفەنگە

ب قەلەم و دەعوا و دەنگە
رزگار بکە کوردستانا بەهاسەنگە

ئەو کوردستانا شوخ و شەنگ و رەنگینە
ل ژێر دەستێ دوژمنا هەردەم حەزینە

هندی کو هەبن زوردار و خوینمێژ
دێ هەبن هەڤکارێت خائن خوینرێژ

دێ حالێ مە کورد ئەڤە بیت و هێشی
خو هشیار کەن مە کارەکێ مەزن لپێشی

هەستن بران و خو هشیار کەن
دەست لسیەکێ بگرن حل بو ئێک خار کەن

بووە غەریب خو کا زو بار کەن
ل مە پەیدا نەبیت چە نگر خو دیار کەن

هەستن بکەن خەباتێ ل سەر چیا و دەر و گەلیا
دا ل نیشتیمانێ نەبن شەرمەدە و روهسیا

مللەتێ دەربینن ل ژێر دەستێ هەمیا
ب قەبینن وەکی «کاوە» یێ ل سەرێ چیا

ئازاد کەن ئێخسیر و مەحکوم و بەندیا
خوشکەفادلێ ئەسمەرێن چاڤ ل رێیا

ژ نوی خوشکەن کەیفا زەوی و زەڤیا
عاڤ دەن ئەوێ هشی بوی ل هەلالو شەنگە

دانین حوکمێ کوردا ل هەر چار جیا
ل عیراق و ایران و ترک و سوریا

گەلی برا نەبوچەندا بەلکی بوە هەبە
مژدە بدەن بو شەهیدێن کو خوینا وان لێ رژیا

ل سەر خاکا کوردستانێ کو ئازادی د ڤیا
بەرێ رەڤا و اهاتە چێ تو عەفو کە خاوەکەرەم

عەدالەتێ بێخن هەمی دەرا ل دەشت و چیا
پیلکەفن ب چەرن گورگ و بزن دگەل کو ڤیا

هنگێ بنێرن براخو ئێک دوگرت خەبەریا
بو نە دەولەتێ ئەرێ ماهوین خرابترن ل جوویا

بلا بەس بیت نەهێلن ل بەرینا خو نەیار ریا
دوژمنا کەتێ جیاوازی بەرینا رەش و سپیا

((١٢))

# (٧) «وارێ مه نه یار بارکه»

نه‌یار نه‌یار نه‌یار بارکه ل ڤی واری
وارێ مه نه یێ ته یه تو زورداری

نادەم ژ ته‌را ئه‌ڤێ خاکێ و دار و باری
نافی دەرکه‌ڤه ده‌حل و دری کوره ماری

ئه‌زم ئه‌زم پیشمه‌رگه مه ته چاڤ تاری
بۆ وەلاتێ جانه فیدا مه سویندا خاری

وارێ رەنگین جێژا مه‌رو په‌زکێڤی یا
نادەم دەستێ خوینا مێژو روی ب ته‌نی یا

هه‌می بیشێت مه هه‌دو پلنگ و حه‌یده‌ریا
ناهێلیت بگیرن وان دەهبه لوێ و رویڤیا

لسه‌ر دارا دخوینن بلبل که‌و گه‌لیا
کەوی روباد لسه‌رچیا بەرکه‌ڤی یا

هیچ تو نه‌شێی خراب بکه‌یی ڤی دیواری
ئه‌و دوم دومه مه چێکری ب کار و باری

ئه‌گه‌ر شه‌ڤ چو هژ بالا بو نه‌ما تاری
روژ دێ هه‌لێت دێ روناهی هێته واری

هو برا پنو چما ناکه‌ون کار و باری ؟
پێکڤه رابین مێر د به‌روژی و ب‌ی دنزاری

دەست یا ڤێژن چه‌کێ سه‌ قاب ژه‌هراهاری
کو تکی هوانێ سه‌ره‌دێ ئه‌ڤی زوردای

رزگار بکه‌ن گه‌لی برا گه‌لێ ئاری
بده‌ریێن ل ژێر دەستێ ڤی خوینخاری

ئه‌لندا گه‌ش کەس نه‌دایه ب شه‌ڤا تاری
کو ئه‌و نه بن شه‌ره‌ف فروش به‌رتیل خاری

روژه‌ک دێ هێت دێ روناهی ئێته واری
به‌لێ نزا کا دێ بینم یان دێ بارکه‌م ب یەکجاری

ئه‌گه‌ر ئه‌ز چوم (سه‌ردر)ی نه‌ دیت خود موختاری
هوین ببیژن ره‌حما یه‌زدان ل ته باری

٢٠/ گولان/ ١٩٨٧ ز (بامەرنی)

(١٠) «ڤینا وەتەنێ ئیمانە» «١٧»

کەسابەتێ و کارێ مە
کوردستانە پشتێ مە

زۆر گرانە بارێ مە
هەمی وەرنە هاری مە

هەمی دەما لهزرا مە
رانا وەستیت زاری مە

گەلەک خۆشە وارێ مە
بۆ دهەلبێت جانێ مە

زۆر پێ دهێت بێهنا مە
بۆ د بۆ هۆ ژینێ دلێ مە

تێنیت هو لکرێ جیهانێ
جهێ کەیف و سەیرانێ

کەفتە بەر بوردومانێ
بێکەسێ و بێ خودانێ

دوژمنا هەمی سوتی
خێر و چاکی لێ کوتی

هەمی جهێ شێرانە
مێژەک ١٩ ب سەدمێرانە

ناڤ سەنگەر و چەپەرا
خۆ راگرن ئەو برا

بەلێ چیبکەم برا دەر
خۆ ب خۆ بونە دوسەنگەر

بەر ڤینا مالێ دنێ
کەفتنە سەرخارنێ

خارنا بیسو چەبەلا
ژینا لمە کریە بەلا

کرما ڤجو بو ج نزانی
لخوناکەمی بەرەڤانی

جانێ خۆ بکەی قوربانی
ڤی وارێ هوێ جانی

ڤینا وەلاتێ ئیمانە
کارەکێ زۆرێ جوانە

مشیرەتا گشتێ چاکانە
خودان عیلم و عیرفانە

کاک و دابچی جەنەتێ
تۆ دەر بچی ل مێحنەتێ

## ( ١٥ ) «هندەک پەسنێ وەلاتێ مە» « ٢٧ »

گوهدار بن ڤێ وەسفە تحە
لمغاڤ وەلاتێ خو بثریف

خودێ دامە جهەکێ خوش
مێرگو چیمەن ئاڤا شرین

چیایێت بلندو دارو بار
هەمی کوێستان هەوای هوین

ناڤ گەلیا و سەرێ چیا
هاڤین هەوارێ خەم رەڤین

تژی هەلال و نێرگزن
هەمی تەرزا مە گول چنین

زورن گیال جەشت و چیا
دەرمان دکەن کول و برین

ئاڤ کانیێن وەلاتێ مە
درێژ دکەن تەمەن و ژین

نیشتە جهێ بەز کوڤیا
پلنگ و شێر هەر لێ دژین

جهێ جوت و کشتو کالێ
مە زەحفە دەشتا بەرین

مە هەر مێرەک بسەد مێرا
دەماشەر سوپا جەمین

تو بسیارکە ل نێرە شێرا
چ خوش مێرن لێ نارەڤین

دلێ وانا دلێ شێرا
دشەرو چەنگا دەستێ هەلین

بەر شدەتو بە ئساوان
لدەولەتا بژاندین

هەر دەمێ کورد بینە ئێک
پەرال مە دێ وەرین

بلابگرن کورد عبرەتا
لواکەسێن بوینا دوجین

ئێک بونا فەرە بو مە کوردا
داسەر بلند ئەم بژین

خابن مە پێدا چو
بو وێ خاکا زەر زێرین

هەنەکانی و دەریایێت بوش
ل کوردستانا ڤاق مشرین

((٢٩)) (١٦) ((نامەیەک بو مەلا حاجی))

سلاڤاتێ ل سەر تە بن مەلا حاجی
پرسیارام ژ حالێ تە بن تە ئەحوال چی
دوعا گومە بە هەر هەبن مە کرمانجا
د دنیا و د ئاخرەتێ مە هەمە دهەلین

خەما مە خو یاڤێ ژ دلی کولوخە ما
وەیە برایێ حەسیەت ژی بو مەنەما
بەلێ چیکەین دەرمان ئارام هەبی دەما
حالێ مژی حالێ تەیە وەرە ببین

تو یێ هاتی تە یا هێلای ئەسەروکانی
داخانەخو دنیا دەورە تو ژی دزانی
روژەک دێ هێت بنە تارا ژ نوی دانی
گەر ب مینین مقی دەردێ نەکوژرین

گاڤ و کاتا خە یالا لایێ تەیە
دلێ مە ژی دگەل ئێشا دلێ تەیە
وان زوردارا دلێ وان ژی نە بمەقەیە
هەرخودایە دەرمان دکەت دلێت برین

هیڤیدارین ژ دەرگاهێ خودا بکەت
دارێ خورتا ل سەر سەرێ مە ژی پاکەت
شولا مە ژی ب نیڤا دلێ مە چێکەت
ل دەریا کلوخەما ئەم دەر بچین

ئەم دەربچین ل بەحرەهارێ
گولا بچنین ل ئادارێ
بدەین دەستێ وێ نازدارێ
بەلاڤ بکەت یا خەم رەڤین

فەلەک دگەل مە ببیت وەفا
زوی قربکەت کەرین سەفا
مەرونا هر بێتە چە هەڤا
وەفا دارتو ل ((مەم)) و ((زین))

ئەو بو هێڤیا مە بچارا مە ب ووێ هێڤێ هەبو

ئەو بو ریباز بو مە هەمیا لەو نەیارا کینە بوو

ئەو بو بو مە خوشی خەزینە نە پێتڤی کەسێ ئەم

لێ نەیارا کرە تەکبیر ئەو کە نجامە بەرزە بوو

ئەو بو بو مە ڕونی چرا ئو شە مالا مللەتی

بەلێ لێدا باو باڕوڤێ ل هێزاوێ زێدە بوو

ئەو بو بو مە جهێ ژیان ئو بهەشتا سەر زەمینێ

بەلێ چبکەم بو مە دوزەخ ژەهرا کوژەک بەهرە بوو

هندی بێژن کەسەک خادەمێ وەفاجهێ کوردا قەمێ

تەنج دڤێت هەمی حازر (خودا) نعمەت زێدە بوو

ئەو بو جهێ رەزو باغا هەمی رەنگا فێقی هەبی

بەلێ خامەت سەخبێرکرن ئاگرو هێتینە بوو

دێ ببرە ئو نەچینە ل کوردستانێ هاتە جێ

هەمی کاڤل ئو وێرانە کوچ دەورا هونە بوو

ئەو بو جهێ پەزی زەحف ل کویستانا دچەرێ

ئەو زی دوژمنی کرە تالان ل پەزێ مەیالە بوو

ئەو بو جهێ جوار مەلیونێت مە کرمانجاد (عراق) ێدا یێ دژین

ب دریژیا ششت سال پتر سوتن و برڤادەر بەدەری و ئاوارە بوو

هیچ ناوەستین ل خەباتێ تاوەلات رزگار نەکەین

خەباتا مە چەند پیروزە ل ناف خودا و دەرقە بوو

(سەدر) بەسسە بو مە بێژە مەزانی داخازاتە

ریبازا خو ئەم ناهێلین گوهێمە ل گازیاتە بوو

کانینادوی / ١٩٩٠ ز (نەفتی شاهو) ایران

دناف جەبەرا

## (١٩) «هاڤینا د ژوار»

هەی هاڤینێ چەند د ژواری
ل مە داهاتی ل ڤی وارێ

ئەڤ وارێ مە فێنک ببو
هاڤینگەهەک لێ گەژ ببو

هاڤین تو بگەرما خو ژی
ڤی وارێ جوان ل مە دسوژی

ل مەڤە لیان رەزو باغە
نەما ل وارێ یارەک ساخە

هەی هاڤینێ تە بو وەکر
ئەڤ ئێشتوینە بو مە هەلکر

تە گەرما خو ل مە باراند
ح دو زەخە ل مە شاراند

بایێ سەمیر تە بالا کر
ب دەردو ئێشا لالا کر

تە تاوی کر بەزێ مەژی
تە شولو قاند ل مەمەژی

بوچی هندە بگەموزی
دل بگەسرێ تە ناسوژی

هێژ نشا پێشولە بێ سوزا
بشتە ڤانیا واکەر موزا

ب سەرکێشا واکەرمێشا
هەمی هاتن پێشە پێشا

سەوزەوات و خاردەمەنی
بگەرماتە بو نەگەنی

تە جلکێ ژی ل مە خەنزراند
تە عەنتەر ژی ل مە گازراند

هندی تیتێن هزرو بیر مە
نەداهاتی هوسا تیرمە

هەی هاڤینێ ستەمکارێ
تو پلەکێ وەرەخارێ

نەداهاتیە هو رەنگ هاڤین
ل ڤی وارێ هو بێ شەرین

نێ وارێ مە ب ناڤ و دەنگ بو
بەلێ هاڤین ب شەرو جەنگ بو

ح هاڤینەک ب تەم و توزی
بگەردەلول و خودان دوزی

« ٢٩ »　　«ناڤێتە هەر مایە قەلات»　　(٢٠)

ب هاتناتە گەش بو وەلات
وکوردارا توبوی خەلات
ب چوناتە ژار بو وەلات
ناڤێتە هەرمایە قەلات

تو ناسناما مە کوردا بوی ل جیهانێ
سالارەکێ بێ وێنە بوی ل کوردستانێ
سەدێ بیستێ نە بون وەکی تە دمەیدانێ
بەرز تو بی سەرکێش بوی ل گورەپانێ

تو خەمخورێ گەلێ خو بوی
داخاز کەرێ مافێ مە بوی
تو زانا بوی تو رەهبەر بوی
تو رێزانەو پێشمەرگە بوی

بنەواسە بو کوردا دانا
دوژمنێ نەچار دەت بەیانا
«موستەفا» ئێ تو بوی دانا
رەحمەت ل تە وەک بارانا

(بامشمش) زا (٢٠٠١)

((٤٥)) (٤٢) (دل دبێ خو ما گه‌هدار بی)

گه‌لی برا خو هشیار که‌ن
هه‌می بێلقه ب ئێک جاری
ئه‌ صێن که‌ فتێن داڤ و به‌ندا
گشت نه‌ یار و شه‌ڤێ تاری

کێیه‌ دبێ مه‌ کێمه‌ ئیمان
کانێ علم کانێ عیرفان
هه‌می برن خه‌لکێ بیانی
هه‌وارامه‌ ره‌ببێ باری

زوره‌ کوفرو زوره‌ ئیلحاد
هه‌می فسق و هه‌می إفساد
نه‌زانینه‌ و نه‌ ما ئیرشاد
روژا ل مه‌ کریه‌ تاری

ره‌ش به‌له‌کی دله‌ پیژن
زوربه‌ی ل وان خار و دزن
زور ژی دمه‌ست وسه‌رخوشن
هه‌ما ڤێکرا حه‌رام خاری

سینه‌ها و مه‌ی خانه‌
شه‌ڤ و روژێ شولاوانه‌
گرفتارێت دمه‌لهانه‌
له‌وا ل مه‌ غه‌زه‌ب باری

نه‌وان وه‌عدو نه‌ په‌یمانێ
ئه‌و نه‌وه‌یێ باش دزانن
ئێ سیحر و حیله‌ بازن
ژبو پاره‌یه‌ به‌رتیل خاری

بو باش کارا چاڤ تارینه‌
ژبلی خو که‌س به‌ر نینه‌
له‌وا دساخن دمرینه‌
کودێ بار که‌ن لڤی واری

(٢٥)

## ( ئامۆژگاریێ ژخەورابنی ) (( ٤٧ ))

کەلی بەندو موسلمانا
شعرە زریف مە ژی دانا
بو وە هەمی موسلمانا
بگرن رێکا چاک ئینسانا
کارو عەمەل بدل و جانا
ب حەدیث و ب قورئانا
ژخەو رابن دونیا وارە
وارێ مە هەر وارێ یارە
کەسێ کری کاروعەمەل
سەربلندە کو هات ئەجەل
بێ مەغرورو نە هوشیارە.
روسیاهـ و شەرمەزارە
خوهوشیار کەن ئەمێ غافلین
هوین بچینن توڤی خاوین
مەرج چاندی درینی ژویە
سزای چاکێ هەر چاکیە
ژخەو رابن موسلمانین
ژخەو رابن یا حەیرانین
کاروان دەرکەت بو لایێ بارێ
تاعەت بوخو وابژاری
خەلەت دکەن هەمی دەما
رەحما خودایێ ل وان جەما
دجەنناتێ بونە میهڤان
تەجەللا کر خودایێ بوان
هەوار بوتە (سەدرودینی) و
تو هەسپەکێ چەلەک بینو

گو بدێرن ڤێ شیرەتێ
کامل بگرن سەمعیەتێ
دینو دونیا کو بێقەتێ
رێکا خێرو سەعادەتێ
روژەلێ دژوان یال دویمەتێ
تەمام بکەن هوین خزمەتێ
بنەتار مە ل قیامەتێ
کەس بێنا بەت ج راحەتێ
دڤێ ژینا سەر ساعەتێ
دێ کە ڤیتە خوش لەززەتێ
نەکەت کارێ قارعەتێ
ئاخ و ئوڤێ ژێ دەرکەتێ
بکەن جوت و زراعەتێ
یا ڤێن جهێ سەلاحەتێ
گاڤا کو هاتە حاسلەتێ
خودان سوبحینێ دمحنەتێ
خەو وغەفلەتا شەڤاوەتێ
قافلە دەرکەت کەس ناگەتێ
ب مارەما تجارەتێ
شەڤ روژا دخلمەتێ
فایدێ مەزن بو پێڤەتێ
بونە میهڤان دجەننەتێ
حورو ولدان دخلمەتێ
زیدە باری هەر نعمەتێ
تو بێ ڤەمایی ل قافلەتێ
بارکە ل زادێ ئاخرەتێ

(٢٩) «محمد شاسوارێ بوراقێ» «٤٩»

(محمد) شاسوارێ بوراقێ
ئیماما (کعبه) و رواقێ
سوارێ گه شتێ عیلاقێ
وەکی برقێ وی هاژابو

دەوارەك زیبا برقدار
چوست و چالاك و بالدار
سەرخاترا نبیێ موختار
جبرائیلی بو ئینا بو

دبەینێ دا ئیسرا پێکر
رێکا مانگەك کێم شەفێ کر
قەسدا مزگەفتا قودسێ کر
ل ئەقسایێ ئەو پەیابو

شیرو شەرابێ ژێرا ئینا
«فطرة الله» ئەوی بینا
دەست راکرو سەرهەلینا
شیر پیروزی وان لێقابو

نور جەمابون د مزگەفتێ دا
خێرا خودایێ هەمو تێدا
(محمد) سالار بو دقودسێ دا
خودای پەیمان ل وان ستاندبو

پێشی نفێژی بو هەمیا کر
ئیماما پێشینا و ئاخر
عەلەمێ عالەم (أحمد)ێ فاخر
کو سەرداری وان هەمیابو

پاشی میعراج بو وی دانا
داخاز کریە بو ئاسمانا
بو دل خوشی و نیشادانا
قدەم ل صەخرەت واللە بو

برانو حاحیف و خەم بوچاوا
بوسولمان ل خونا کەن چارا
چاڤێ وان هەرێ ل دولارا

نەڤیێت جهـ و وارێ خو
نەغرەت دان ل توڤێ خو
کێڤە بچین ئەم بخو

دێ چین دەولەتێن بیانی
دا ل مە بکەن خودانی
ل بیر چو سفرا یەزدانی

سفرا خودایێ بەرینە
ج هەوجەیێ دەرڤە نینە
قایل بون بوتە ژینە

دێ چما ئەو دنیا چکەیێ
دێ تو زاروکا دەسدەیێ
یان ئاییێن بزر کەیێ

تو خودێ مائە و ژینە
بپێشینان هو نە بینە
مالە ڤ کارە شەرم نینە

لێ ما تو موسولمان نینی
ل بیانیا دکەیێ غولامینی
شەرمێ بکە ژ دینی

گەر قوتابی یا بالیوزێ دەولەتێ
بو دوزا گەلێ خو یان تجارەتێ
تو نەساخی یان تو دێ کەیێ دەعوەتێ

ل وێ چاخێ رێ بوتە هەرا دایە
خودان بەهری ج چاکی تە وێرا یە
ژبێ وێرێ بو دینێ نەرەوایە

لناڤ وەلاتێ خو ب مینە
بو گەلێ خو حو بوەستیە
خودێ رازقە و کەس دێ نینە

کافران دلێ وان هەرو هەرێ دەغەلە
دڤێت بوسلمانی ب کەنە جوی یان ژێ فەلە
زورا ب سەرهاتینە ئەڤ مەسەلە

بوسولمان چاڤ دوربینا گەلێ خوبە
ئیرو تو زور هوشیاری حالێ خو بە
زورن پەیوڤێ تو پلنگێ جیاییێت خوبە

سەحرو ڤیدیو و دجی تال
ڤەژاتینە بو وان مال
لێ هەما هەر ئەڤەیە حال

ژن و زارو ل پێشی وەستان موقابل بون
ب دیداران سەرکردان و غافل بون
دەرس و دەورو عبادەت وان لێ بەزر بون

صبحه کێ من دیت خو یا بو
پڕ مشـــریێ مثلێ گولا بو
یا إلٓهی دێ چه وابیت
« دێ عورفیا مشێخێ ڕابیت »
من دزانی حال فه نایه

من دزانی حال ئه لیمه
مشاکرم ب ره حما عه لیمه
من ڤه کر ڤالا که ریمه
«کو له دارێ وی مشێخی مه »
ئایه تا مه وتێ خویانه

ئایه تا مه وتێ غـه داره
مشێخ ل به حرێ بو سواره
چونه بێیش وی گه ر دوباره
«که تیه ده ستێ گورگێت هاره »
ڕازیه ب ئه مرێ خودایه

ڕاضیه ب ئه مرێ له طیفه
مالکێ مشه رعێ مشه ریفه
وێ ل سه ر قه سرا عنیفه
«زانایه ل زورێ زریفه »
گرتیێ سێ ساله یه

گرتیێ سالا ده ها هی
که فتیه به رفه ضلا إلٓهی
ره حمه ت و الله علیـه
«وه ل گورێ والدیه »
له عنه تێ والله ل وایه

له عنه ت والله ل ئه هلی مشیرکا
خاج حه بینێ ڕوم و تورکا
زالم و ڕوم و غره نگا
« دوژمنێت سیما و ره نگا »
قاتلێت مشێخی مه یه

قاتلێت نه سلا رسـولی
مشێخه کێ همه تێ قه بولی
قه د نه کر ل جه ددێ قسـوری
«کوردنامری خوم کره گوری »
طالبێ ڕوتبا خو یه

---

ئه ڤ هوزانه که هشته ده ستێ من ژلایێ سه یدایێ به ڕێز (علاعیسی قشختی) شیهی کو ل سالا ١٩٥٢ فراینێ وی ل به رکربو که هاتیه ئه ههاندن ب سیداره دانا سه یدای دینێ وخه م خورێ دوزا گه لێ خو ( ) یاخودا ل مه و وی خوشبیبی. منیش ئه ڤ هوزانه کره پینج مالکی وئه وا د ما به ینا دوو کڤانادا ل زیده کرنا منه

صدرالدین محمد صادق
٢٠٠٧ م

جەژناما ڤێ رەمەزانێ
هات نافێ سەنگەرا ل ئیرانێ
ئەرێ گەلو خوشی كانێ
بێ سەربەستی دچینە ماله

نە دئازادین چێن مالێت خو
خوشكەین كەفا زاروكێن خو
بجین جەژنا هەڤالێت خو
ما ین غەمبار فەمە حاله

خەلك وعاله مێ كەیفا خوكر
بدو قول هاتو چوكر
سەرەدان و عید پیروزكر
مەژی ل ڤێرێ عیدلێ تاله

مەعید تاله ل ڤێ دەمێ
كو سەربازین تێ ئەم هەمی
هەمی گافا دبیین فەمێ
ئازاد ببین چینە ماله

ئەم نزیكی سیسەد هزار
هەمی كوردین ب یەك بریار
خەما مالێ مە بو سەربار
بجیك وجاحیل وكاله

مەفەنەڤێت مەدڤێت یادی
سەربەست بژین وەك گەلێن دی
مەژ كوردادا دڤێت ئازادی
كوردوستان عید و سەرساله

خارن نینە تێرێ بخوین
مەئاڤ نینە خو پێ بشوین
چ جه نینە كێڤە بروین
مەهزرەت ئاڤاشرین زەلاله

ئاڤا شرین مەهزرەتە
خو پێ بشوین نەدامەتە
ئاڤا سویریش بێ لەززەتە
تاما زاری هەرا تاله

هیڤیدارین ل تەیەزدان
مەرزگاركەی ل گشت نەخوشیان
مەتەسریح كە خودان إحسان
د دونیا و د ئاخرەتێ خوشكەیێ حاله

١٩٩١-م / إیران نەفت شاه

( ٤٥ ) «سلام إلى ملاحاجي»[1] (( ٨٠ ))

عليك سلام الله من «الصَّدر» سلاماً يُبعِدُ الحبيب من القهر

ينقله نسيم الشمال بنور البدر إلى قلب جريح بسهم الغدر

هو (الملاحاجي) رفيع القدر ليته يرى قبل نزول القبر

جواباً عنه ياشن مه داقه إنفتحت وَردتنا بين بني وخوناقه

تحررت كوردستاننا بـ ئازادي ماقه نَسَجنا برلماناً بەرسفا دوژمنا داقه

رأيناه يا حبيبي من دساخي هەردو چاقه قد حققت آمالنا نه فتامه كارێزا ئاڤه

١٩٩٥/١/٢١-م/ باشمش

( ٤٦ ) «للك يومان»

لك في الدنيا يومان يا بشر يومٌ قدر ويومٌ لا يأتيك القدر

ففي أيٍّ من اليومين تحذر فيومَ لا لا ترتاحُ ولا تصبر

ويوم يأتيك القضاء حتماً والقدر لا يفيدك الفرار ولا ينجيك الحذر

١٩٩٥/١/٢١-م/ باشمش

[1] هو ملاحاجي بن علي بن عبدالقادر/ الستروكاني، الزيباري.

# ناڤەرۆك



## پشكا ئێكێ

## هەلبەستێن ب زمانی كوردی

## پشکا دوویێ

## هەلبەستێن ب زمانێ عەرەبی

